23

پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان
بەشی سێیەم



# بازرگانیکردن بە دەرمان



کۆمەڵێک نووسەر

وەرگێڕانی:

ماجید خەلیل - شاناز ڕەمزی هیرانی






دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە

خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا

لێپرسراوی دەزگا: ئەنومر حسێن


پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان- بەشی سێیەم-

سەرپەرشتیار: سابیر عەبدوڵا کەریم



# بـازرگانـیکردن
# بە دەرمان

کۆمەڵێك نووسەر

وەرگێڕانی: ماجید خەلیل - شاناز ڕەمزی هیرانی

2018

23

سەرپەرشتیارانی پرۆژەی چاپکردنی کتێب

ئەرسەلان حەسەن        بابان ئەنوەر



**بـازرگانـیکردن بە دەرمان**

ناوی نووسەر: کۆمەڵێک نووسەر
وەرگێڕانی: ماجید خەلیل - شاناز ڕەمزی هیرانی
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد
پێداچوونەوەی زمانەوانی: کارا فاتیح
هەڵەچن: نیاز کەمال- کەیوان عومەر- ئاسان عەبدوڵلا
تیراژ: 500 دانە
ساڵی چاپ: 2018
چاپ: چاپخانەی حەمدی
نرخ: 3000 دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن ( 1438 )ی ساڵی2018ی پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا

زنجیرە ( 280 )

www·ideafoundation·co
2018idea@gmail·com
www·facebook·com/dezgai·idea
07705996990 - 0533220180
سلێمانی - گردی سەرچنار- نزیک کۆمەڵگەی بەهاران

# پێڕست

## پرۆژەی توێژینەوەی جیهانییەکان بۆچی؟

توێژینەوەی جیهانی زنجیرەیەک نامیلکەی تایبەتە بە روداو، ئاڵوگۆڕ، کێشە، قەیران، پەرەسەندنە سیاسی و ئابورییەکانی جیهان، کە ناوەندە سیاسی و ئابورییە زەبەلاحەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووەو بەردەوام لێکۆڵینەوەی وردو زانستی و ئاکادیمییان لەسەر دەکرێت، بەمەبەستی باشتر درککردن بەقەیرانەکان و دۆزینەوەی رێگاچارەی گونجاو بۆ چارەسەر، یان زاڵبوون بەسەریاندا. پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان یەکێکە لە

پرۆژەکانی تازەکانی دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە. بەشی یەکەم و دووەمی توێژینەوە جیهانییەکان چاپ و بڵاوکراوەتەوە و ئێستاش بەشی سێیەمی توێژینەوەکانی بۆ خوێنەرانی بەرێز بڵاودەکاتەوە، کە بە شێوەیەکی وردو رۆچوونی ئەکادیمییانە گرنگیی داوە بە دیارترین گۆڕانکارییە نێودەوڵەتییەکان.

ڕوداوە سیاسییەکان ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان، پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ لە هەر کوچە و سوچێکی ئەم جیهانەدا، کاریگەرییان لەسەر کۆی سیستەمە سیاسییە لۆکاڵ، یان گلۆباڵەکان دروستکردووە. جا هەندێک لەوانە سروشتی یان خۆرسکن هەندێکیشیان بەهۆی دەخالەتی وڵاتانی زلهێزی سیاسی و ئابوری و سەربازییەوە ڕوودەدەن (لە بابەتی پیلانگێڕی، کودەتای سەربازی، تێڕوانینی چاوچنۆکانەی ئابوری و سەرمایەداری و ئەوەی ئەمرۆ پێی دەوترێت بازرگانییە نایاسایی و قەدەغەکراوەکان و بەکاڵاکردنی مرۆڤ) یان بە ئارمان و ئامانجی سیاسی جۆراوجۆرە لەماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا، لە سەر گۆی زەوی گەواهی ئاڵوگۆڕی چاوەڕوانکراو، یان

چاوەڕواننەکراو بووبن، کە هەندێکیان خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە و هەندێکیشیان بوونەتە هۆی شەڕو کوشتاری بێ ئامان و ماڵوێرانکەر، کە بە ملیۆنان مرۆڤ گیانیان لەدەستداوە.

جیهان لەسەر دەستی زلهێزەکان و کارتێلە گەورەکانی بواری سەرمایە، وزە، نەوت، سەربازی و هەژمونی ولاتانی خۆرئاوای سەرمایەداری، ئەوانەو هەژاری و نەداری و سیستمی تۆتالیتارو میلیتاریستی ولاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست لە ئاسیا، ئەفەریقاو ولاتانی خۆرهەلاتی ئەوروپای کۆن و بەشێک لەولاتانی ئەمەریکای لاتین، پڕە لەجینایەت و کردەوەی دڕندانەی سەرکوت و داپلۆسین و لەسێدارەدان و کودەتای سەربازی و برسیکردن و هەژارتربوونی هەژارەکان و سیستمی زاڵی دیکتاتۆرییەت و ژیانی مەمرەو مەژی.

پاشماوەکانی جەنگی ساردی نێوان بلۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیستی هێشتا ئاسەواری بەسەر جیهاندا ماوەو تادێت ولاتانی جیهان زۆرترو زیاتر خۆیان پڕ چەک دەکەن و لەهەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی و ئەتۆمی زیاتردان و

کۆمپانیاکانی چەک فرۆشتن رۆژانـە مۆدێلی نوێ و تازەتری چەک و فرۆکەو کەشتیگەلی مەترسیدارو گرانبەها دەخەنە بازاڕی ململانێوە.

لەسەر ئاستی جیهان فایلی گەرم وگوڕو پڕ کێشەو قەیران بەردەوام روودەدەن و دووبارە دەبنـەوە بە بابەتی (شـەڕی نیمچە کیشوەری هندستان و پاکستان) کێشەو ململانێی نێوان سریلانکاو پڵنگەکانی تامیل بەکێشەو هەژاری لە بەنگلادیش، شەڕی گرووپە ئیسلامییە رادیکاڵەکانی ئەفغانستان، کشمیری پڕ لـە پشێویی هندو پاکستان و چین درێژەی هەیە.

لـە ئاسیـا، ئـەفـەریقا شـــەڕو کوشـتـاری هێزە شیعی و سوننیەکان لـەعێراق، یەمەن، سوریا، ئەفغانستان و لوبنان تادێت ژمـارەی کوژراو قوربانییەکان روو لەزیادبوون دەکات لـەسەر دەستی گرووپە ئیسلامییە رادیـکاڵ و فـەندەمێنتاڵـەکان، کـە لـەلایـەن عەرەبستانی سعودیە، قەتەر، تورکیاو کۆماری ئیسلامی ئێران هاوکاری و باربوو دەکرێن و بەریانداوەتە گیانی یەکترو هەر ئەم گرووپە ئیسلامییانەن بوونەتە مایەی شەڕو کوشتار و جەنگێکی ماڵوێرانکەر لە

عێراق، ئەفغانستان و فەلەستین و مالی نەیجیریاو تادەگاتە رادەی ئاستی مەترسی تیرۆرو کوشتار لە پاریس، واشنتۆن، رۆما، لەندەن و مەدرید.

هێشتا فرۆکەکانی ولاتانی زلهێزو ژێر دەریایی و کەشتیگەل و بنکە سەربازییەکانیان لەمسەر بۆ ئەوسەری جیهان دەفرن و باشتر دادەمەزرێن و هەرەشەی زۆرترو زیاتر لەجیهان دەکەن و بەردەوام دوکەڵی بۆمبەکانیان بەسەر ئاسمانی ولاتانی هەژارو بێ دیفاعی خۆرهەلاتی ناوەڕاست رەش دەچێتەوە. ئەم زنجیرە نامیلکەیە، ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بەو روداوانەی کە بیەوێت یان نەیەوێت، کاریگەری لەسەر رەوشی سیاسی کوردستان جێدەهێڵن.

دەزگای ئایدیا ئەم هەنگاوەی لەو پێناوەدایە، کە خوێنەری کورد ئاشنابکات بەو ئاڵوگۆڕە باش و خراپانە و ڕوانگە و تێڕوانینی فراوانتر بکات، کە جیهان بە تەنها بریتی نییە لە ڕوداوگەلێک کە لەناو خۆمان یان لە دەوروبەرمان دەگوزەرێت. بەو ئومێدەی ئەم زنجیرە نامیلکەیەی دەزگا ئایدیا هەوڵێک بێت بۆ دانانی کاریگەری باشتر تێگەیشتن لەو روداوانەی لەجیهاندا دەگوزەرێن.

## بەشی یەکەمی توێژینەوەی جیهانی (1ـ 10)

| ژمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | سێگۆشەی گرگرتوو | ولیام داریمپل | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |
| 2 | دەروازەیەک بۆ ناسینی جەنگی عێراق - کوەیت | هەلگورد جەلال | / | 2016 |
| 3 | گەشتی دوورو درێژی ئەتۆمی ئێران تێچوون و مەترسییەکانی | عەلی فائیز – کەریم سەجادپور | سۆران عەلی | 2016 |
| 4 | چەتەکانی دەریا لە باشوری خۆرهەلاتی ئاسیا، خۆرئاوای ئەفریقیاو سۆماڵ | مارتن میرفی | هەلگورد جەلال | 2016 |
| 5 | خەبات لەپێناو فرەییدا دوای شۆڕشەکانی باکوری ئەفریقیا | ئەنتۆنی دۆرکن | سۆران عەلی | 2016 |
| 6 | جولانەوەی ئەمازیغی و دینامیکیای ژیانی سیاسی لیبیا | بیلال عەبدوڵلا | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |
| 7 | نەوت و گازی شیلی ئەمەریکاو ئاکامە جیۆپۆلۆتیکەکانی | بەهزاد ئەحمەدی لفورکی – مەسعود درەخشان | ئەرسەلان حەسەن | 2016 |
| 8 | کۆچ لە جیهانێکی بێئۆقرەدا | ئەلشیخ بای ئەلحەبیب – رەشید خەشانە | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 9 | تیرۆر، تیرۆریزم و تیرۆریزمی نێودەوڵەتی | د.عەلیرەزا سەمیعی ئیسفەهانی – عەبدولکەریم سالکی | ڕێباز مستەفا | 2016 |
| 10 | چین و سیستەمی بازرگانی جیهانی | ئادیتیا ماتو – ئارڤیند سوبرامانیان | بابان ئەنوەر | 2016 |

**بەشی دووەمی توێژینەوە جیهانییەکان (11 – 20)**

| ژمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 11 | پاکستان و گۆڕانکارییەکانی ناوخۆو دەرەوە | کۆمەڵێک نوسەر | بابان ئەنوەر | 2017 |
| 12 | پەیوەندییەکانی ئێران و هندستان | یەدوڵڵا دهقان – مەهدی کازمی | ماجید خەلیل | 2017 |
| 13 | چین و ئێران | د.فهد مزبان خزار – منوشهر دوراج – مایکل سینگ | محەمەد چیا | 2017 |
| 14 | ژنان لە بەهاری عەرەبیدا | کۆمەڵێک نوسەر | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 15 | سیستمی نێودەوڵەتی هێز یان دادپەروەری | هاکان ئالتینای | ئارام مەحمود ئەحمەد | 2017 |
| 16 | ڕکابەری ئەمەریکاو ئێران لە ئەمەریکای لاتین و ئەفەریقیا | براندۆن فایت – کلۆی کۆگلین – شولت | کۆشان عەلی زەمانی | 2017 |
| 17 | کاریگەرییەکانی دابەزینی نرخی نەوت | ڕاپۆرتی وەرزیی بانکی نێودەوڵەتی | سابیر عەبدوڵڵا کەریم | 2017 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 18 | پێگەی ئێران لە خۆرهەڵات ناوەڕاستدا | بەختیار ئەحمەد سالح | / | 2017 |
| 19 | مۆریتانیا وڵاتیکی درەوشاوەی کەنارو بیابان | ئەنوار بوخرس | شاناز هیرانی | 2017 |
| 20 | هەرێمی کوردستان و ململانێ ناوچەییەکان | ئەنوەر حسێن (بازگر) | / | 2017 |

**بەشی سێیەمی توێژینەوە جیهانییەکان (21 – 30)**

| زمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 21 | بازرگانیکردن بە ژنان | کۆمەڵێک نوسەر | شاگول عەبدولرەحمان | 2018 |
| 22 | بازرگانیکردن بە منداڵان | د. سرور قاروني – خالد بن محمد ئەلمەرزوق | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 23 | بازرگانیکردن بە مادده هۆشبەرەکان | کۆمەڵێک نوسەر | ئارام مەحمود ئەحمەد | 2018 |
| 24 | بازرگانیکردن بە چەک | نیکۆلاس جیربای | هەڵگورد جەلال | 2018 |
| 25 | بازرگانیکردن بە ئالتوون | کۆمەڵێک نوسەر | ماجد خەلیل | 2018 |
| 26 | بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ | جیهاد موسا قنام – فاطمهة الشمالي | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 27 | بازرگانیکردن بە دەرمان | کۆمەڵێک نوسەر | شاناز ڕەمزی هیرانی | 2018 |
| 28 | بازرگانیکردن بە ئاسەوارەکان | کۆمەڵێک نوسەر | کارناس جوبرائیل | 2018 |
| 29 | بازرگانیکردن بە یۆرانیۆم | د. مەحموود بەرەکات - رومیسا خولابی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 30 | بازرگانی سپیکردنەوەی پارە | کۆمەڵێک نوسەر | شاناز ڕەمزی هیرانی | 2018 |

دەرمان بریتییە لە بەردی بناغە دەستبەرکردنی خزمەتی تەندروستی و کۆمەڵگەیەکی تەندروست، بۆیە وەدەستهێنانی بە ڕێگەی بەرهەمهێنانی ناوخۆیی، یان هاوردەکردنی لە دەرەوە، بووەتە یەکێک لە گرینگترین کارە پێشینییەکانی حکوومەت و وڵاتان بە هەموو جۆرە ئاراستە سیاسییەکانیانەوە. دواتر بە هۆی ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنە ئابووری و پیشەسازی و کۆمەڵایەتییەی سەردەمی ئێستا بە خۆیەوە بینیوە، لەگەڵ خۆیدا تا ڕادەیەکی زۆر پێویستیی دانانی میکانیزم و سیستەمی یاسایی کارا هەیە بۆ ئەوەی هەڵبستێت بە قەرەبووکردنەوەی داواکاریی بەکاربەر، لە بەرانبەریشدا ئەو گۆڕانکارییانە بوونەتە هۆی پەیدابوونی چەندین جۆر غەش و سەرلێشێواندن، کە ئامانج لێیان دەستەخەرۆکردنی بەکاربەرانە.

غەشکردن و ساختەکردنی دەرمان، ئافاتێکی کۆمەڵایەتییە و هەر لە کۆنەوە مرۆڤایەتی پێیەوە دەناڵێنێت.

ئامانج لەو توێژینەوەیە بریتییە لەو پەیوەندییەی کە لەو کێشەیەدا هەیە، ئەویش

غەشكردن لە دەرمان و پێوەندییە ڕاستەوخۆكەی كە بە ژیانی تاك بە تاكەوە هەیەتی، هەروەها لەگەڵ ئەو مەترسییانەی لێی دەكەوێتەوە. لە كاتی ئێستایشدا ئەو كێشەیە بوەتە دیاردەیەكی مەترسیدار و ڕووبەڕووی ئەو مرۆڤانە دەبێتەوە، كە زۆر پێویستیان بە وەدەستهێنانی دەرمانە، چونكە لەو كاتەی مرۆڤ دەتوانێت دەستبەرداری هەزاران بەرهەمی تر ببێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری یەك دەرمان ببێت، كە ڕەنگە تێیدا چارەسەری نەخۆشییەكانی بكات و لە ئازارەكانی كەم بكاتەوە. بەڵام هەندێك جار ئەو دەرمانە دەبێتە بەڵایەكی تر بۆی، بۆیە خەڵكانێكی زۆر هەن دڵنیا نین لە ژیانی خۆیان، چونكە ئەگەری ئەوە هەیە مردن لەو شوێنەوە بێت كە ئومێدی چاكبوونەوەی لێ خواستوە.

غەشكردن لە دەرمان خۆی لە كاڵا و فاكتەر و وێنەكاندا دەبینێتەوە، كە ئاسان نییە دیاری بكرێن و كورت بكرێنەوە. پیشەسازیی دەرمانیش لە كاتی ئێستادا یەكێكە لە گرینگترین پیشەسازییەكان لە جیهاندا، چونكە لە لایەك

بەندە بە ژیان و تەندروستیی مرۆڤ، لە لایەکی تریشەوە ئەو کاریگەرییەی زۆرەی لە سەر ئابوورییەکانی وڵاتان هەیەتی، چونکە قەبارەی فرۆشتنەکانی بازاڕی دەرمان لە جیهان نزیکە ترلیۆن دۆلارە ساڵانە.

بەڵام ئەوەی لای کەس شاراوە نییە، کە ئێستا مەترسییەکانی پیشەسازیی دەرمان هیچی کەمتر نییە لە پیشەسازیی چەک، بە هۆی ئەو داهاتە زۆرەی لێیەوە دەست دەکەوێت، هەروەها ئەو دەستکارییە زۆرەی لە توێژینەوەکاندا دەکرێن.

کێشە و تاوانی غەشکردن لە دەرماندا، تاوانێکە، تێیدا مەرجی زانستی دەستبەرە بە ڕوودانی زیان و پێداگری لە سەر ئازارپێگەیاندن بە مەبەستی وەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر. مەترسیی تارمایی دەرمانی ساختەیش وەک مەترسیی مادەی هۆشبەر وایە. تەنانەت داوودەرمانی ڤیتنەری و بێهۆشکردن و کەرەستەی جوانکارییش دەگرێتەوە.

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی (WHO) یش ڕای دەگەیەنێت، کە ڕادەی کاریگەریی بۆ سەرجەم جیهان لە پلەیەکی زۆر دایە، بە تایبەتی

له وڵاتانی تازەپێگەییشتوو. بە پێی ڕاپۆرتی ئەو ڕێکخراوە، ڕێژەی دەرمانی ساختە لە نێوان لە 15% یە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، بەڵام لە وڵاتانی تازەدروستبوو ڕێژەکە دەگاتە 30%. لە ئەمەریکای لاتینی و ئەفریقایش دەگاتە 50%.

# دەرمان چییە؟

مادەیەکە مرۆڤی نەخۆش بە کاری دەهێنێت لە سەر ئامۆژگاریی پزیشک بۆ چاکبوونەوەی لە جۆرە نەخۆشییەکی دیاریکراو، یان بۆ سارێژبوونەوەی لە جۆرە نیشانەیەکی دیاریکراوی ناتەندروست، وەک بەکارهێنانی دژەترشی، یان قەرەبووکردنەوەی لە کەموکورپییەکی دیاریکراو لە جەستەی مرۆڤ وەک ڤیتامین، یان هۆرمۆنات.

دەرمانی ساختە، یان ساختەکردن بە دەرمان، یەکێکە لە مەترسیدارترین مەسەلەکان

که ڕووبەڕووی کەرتی تەندروستی بوەتەوە لە هەموو جیهاندا، چونکە بە پێی داتاکانی (ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی) دەرمانی ساختە لە نێوان 10% بۆ 30% دەرمانی بەر دەست پێک دەهێنێت لە سەرتاسەری جیهاندا. هەر بە گوێرەی ئەو ڕێکخراوە، دەرمانی ساختە تەنیا هەر لە سەر دەرماندا کورت نابێتەوە، بەڵکوو درێژ دەبێتەوە بۆ سەرجەم دەرمانە گرانبەهاکانیش وەک دەرمانی شێرپەنجە و لە هەمان کاتیشدا دەرمانی وەک حەبی سەرئێشە.

دەرمان، یان شتێکی سروشتییە، یان دروستکراوە، یان نیمچە دروستکراوە: بەو پێیەی دەرمان لە مادەیەکی سروشتیی بنەڕەتی پێک دێت: گژوگیایی، ئاژەڵی و کانزایی.

دەرمانی نیمچە دروستکراو: واتە دەستەبەرکردنی مادەیەکی سروشتی و تێکەڵکردنی بە پرۆسەیەکی زانستیی کیمیایی بۆ ئەوەی ببێتە مادەیەکی تر.

ئەو جۆرە دەرمانە ساختانەیش لە دۆخێکی ناتەندروستدا دروست دەکرێن، کە دەبێتە هۆی پیسبوونی بە بەکتریا و چەندین نەخۆشیی

تریش. زۆر جاریش ئەو دەرمانانە بە جۆرێک دەخرێنە ناو پاکەت و کارتۆنەوە، کە هیچ گومانێک لە سەر ساختەییبوونیان دروست نابێت.

بە پێی توێژینەوەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، لە 48. 7% جۆری غەشکردن لە دەرمان و ساختەکردنی لە وڵاتانی ئاسیاوە دەکرێن، بە تایبەتیش وڵاتانی: چین و فلیپین و ڤیێتنام. لە وڵاتانی ئەفریقایش بە ڕێژەی 18. 7% و لە هەندێک وڵاتانی ئەورووپایش بە ڕێژەی 13. 6% دایە.

بە پێی ناساندنی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیش، دەرمانی ساختەکار ئەو دەرمانەیە کە دەچێتە خانەی دروستکردنی دەرمان بە پێکهاتەی ناکارا، یان هەڵە، یان زیانبەخش، زۆر جاریش دروست کراوە و پێچراوەتەوە وەک ئەوەی دەرمانی ڕاستەقینە بن. بێگومان وایش نییە، چونکە جۆرە مادەیەکی تری تێدایە کە زۆر جیاوازە لە دەرمانی ڕاستەقینە، ئەمەیش وا دەکات شکست بهێنێت لە دروستکردنی چارەسەری پێویست. هەندێک جاریش چەندین

مادەی ژەهراوی و زیانبەخش دەخرێنە ناوی. یان ڕێنماییی چۆنێتیی بەکارهێنانی بە هەڵە دەنووسرین بۆ نەخۆش، دەرئەنجامیش زیان بە جەستەی نەخۆشەکە دەگەیێنێت و دۆخی تەندروستیی بەرەو خراپتر دەچێت. بەڵام ئەوەی لە هەموویان زیاتر قێزەونترە، ئەو دەرمانانەیە کە بە دەرمانی ڕزگاکەری ژیان ناسراون و پێوەندییان بەو نەخۆشییانەوە هەیە، کە لە ناوچە هەژارنشین و دوورەدەستەکان بڵاو دەبنەوە، وەک مەلاریا.

داتایەکی ڕاستودروستیش لە بەر دەستدا نییە لە سەر ڕادەی بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە، بەڵام زۆربەی شارەزایان کۆکن لە سەر ئەوەی کە زیاتر لە 10% دەرمانە فرۆشراوەکان لە بازاڕەکانی جیهاندا، دەرمانی ساختەن. بێگومان ئەو ژمارەیە لە وڵاتانی هەژار و بێدەرەتان زۆرتریشە. زیادەڕەویش نییە گەر بڵێین زیاتر لە سێ چارەکی دەرمانە بەردەستەکانی لە بازاڕی وڵاتانی تازەپێگەییشتوو هەیە، یان لاساییکراوەن یان ساختەن.

بازرگانیکردن بە دەرمانیش، بازرگانییەکی پڕ داهات و دەستکەوتە.

## دەرمانی ساختە لە کوێوە دێت؟

زۆربـەی زۆری ئـەو جـۆرە دەرمـانـانـە لە هیندستان دروست دەکرێن، چونکە ئەو وڵاتە بە نزیکەی 75% دەرمانە ساختەکانی دەگاتە هەموو جیهان. ئەو ژمارەیەیش لە ڕێکخراوی هـاریـکـاری و گـەشـەکـردنـی ئـابـووریـیـەوە وەرگیراوە. دوای ئەویش ڕووسیا دێت، کە لە 12% دەرمانی ساختەکراو هەناردە بازاڕەکانی جیهان دەکات.

## بازرگانیکردن بە دەرمانی نایاسایی:

بازرگانیکردن بە دەرمان، لە کاتی ئێستادا بوەتە خاڵێکی گرینگی ئابووری بۆ زۆرێک لە وڵاتانی جیهان، بۆیە زۆربەی زۆریان بایەخیان داوە بە چاندنی بە مەبەستی بەکارهێنانی لە بازرگانیکردندا. هەندێک وڵاتیش لە پیشەسازیی دەرمانسازی بە کاری دەهێنن، بۆیە بەرهەمهێنانی جیهانی بۆ داوودەرمان کاریگەر دەبێت بە هەرێمی جوگرافیایی و گژوگیایی.

**گرینگترین ئەو وڵاتانەی دروستکەری دەرمان و دامەزراوەی گرینگن لەجیهاندا:**

| ئەورووپا | ئاسیا | ئەفریقا |
|---|---|---|
| 1. ئەڵمانیا: بەرهەمهێنەری دیجتال<br>2. نەمسا: دیجتال و فالیریان<br>3. بەلژیکا: بابوونج ـ لی دەرویت و ناوەندی گرینگی بۆ توێژینەوەی دەرمان نییە<br>4. رۆمانیا: یەکێکە لە وڵاتە هەرە گرینگەکانی هەناردەکاری گژوگیای پزیشکی<br>5. سویسرا: گەورەترین دامەزراوەی دەرمانسازی<br>6. یوگسلافیا: خاوەنی گەورەترین سەنتەری توێژینەوەیە بۆ گژوگیای پزیشکی | 7. چین: بەرهەمهێنەری ئافیۆن و سانسون<br>8. ژاپۆن: گژوگیای دەریایی<br>9. مالیزیا: مەتات | باکووری ئەفریقا: گژوگیای بۆنسدار: وەک کەمون و نەعناع و کەتان<br>میسر: گژوگیای بەنج و سەنا |

بازرگانیکردنی نایاسایی بە دەرمان ڕەنگە لە کارگەیەکەوە، یان بریکاری فرۆشتنەکانی سەر بە کۆمپانیایەکی دەرمان، یان دەرمانسازەوە دروست ببێت، بەو پێیەی دەرمانی بێهۆشکردن یان هەر جۆرە دەرمانێکی تر دەفرۆشێت، کە ئامانج لێی تەنیا دەستکەوتنی بڕێک پارەیە.

ئەوەی شایانی باسە، غەشکردن لە بواری بەرهەمەکانی دەرمانسازی تا دێت زیاتر دەبێت، بە ڕێگەی فێڵکردن و دەرمانی ساختە. بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیایشەوە، کارەکە ئاسانتر بوە. دوا جار بە مەبەستی پاراستنی تاک لە خودی خۆی بە بەکارهێنانی دەرمانی پزیشکیی ساختە، یان ماوەبەسەرچوو، هەروەها لە پێناو گرەنتیدان بۆ پاراستنی ئاستی تەندروستی و پارێزگاریکردن لە تەندروستی و ئازادکردنی لەو نەخۆشییانەی کە بە هۆی خواردنی دەرمانی ساختە تووشی دەبێت، تاوانی فرۆشتنی دەرمانی ساختە، یان بازرگانیکردنی پێیەوە، بە تاوان و بازرگانییەکی نایاسایی هەژمار کراوە.

یەکێکی تر لەو تاوانانەی کە دەچێتە خانەی تاوانی فرۆشتنی دەرمانی ساختە، بازرگانیکردنە

بە دەرمـــان بە ڕێـگـەی ئەنتەرنێت. بـە هۆی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیاوە دەتوانرێت بە ڕێـگـەی بـەکـارهـێـنـانـی ئـەنـتـەرنـێت دەرمـــان کڕینوفرۆشتنی پێوە بکرێت.

جیـهـانی دەرمـــان، جیهانێکی فـــراوان و هەمەجۆرە. چونکە چەندین جۆر دەرمان هەیە و لە ژماردن نایەن، هەیە لە شێوەی حەبە، یان دەرزییە، یان وەک شلەمەنییەک وایە.

**شوێنی بازرگانیکردن بە نایاسایی:**

کۆکردنەوەی کۆمەڵە ڕەهەندێک (زانستی و تەکنەلۆژی و مێژوویی و ئابووری و ئەخلاقی) لە ناو یەک جۆرە کـالاّدا، بە کارێکی دەگمەن و نـاوازە لە قەڵەم دەدرێـت. ئـەوەی ڕوون و ئاشکرایشە، هەموو ئەوانە بەڕوونی لە دەرماندا بە دیار دەکـەون و پەرژینێک لە تایبەمەندیی دەخـــاتـــە ســـەر، کـە وای لـێ دەکـــات پێش سەرجەم کالاّ و بەرهەمەکانی تر بکەوێتەوە. لە لایەکی تریش مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری دەرمان ببێت، چونکە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە تەندروستی و ژیان و جەستەی مرۆڤەوە هەیە، بە تایبەتی لەو سەردەمەی ئیستاماندا.

غەشكردن لە دەرمان كارەساتێكی جیهانییە و زۆریش بەربڵاوە لە زۆربەی زۆری وڵاتان، دەتوانین وەک چیایەكی بە بەفر داپۆشراو وەسفی بكەین، كە لە سەر ئاوە و كەس نازانێت چەند قووڵە. ئەمەیش لەبەر چەند هۆكارێک:

- شوێنەكانیان بە ئاسانی نادۆزرێنەوە.
- لێكۆڵینەوەی بۆ بكرێت.
- ڕادەی بڵاوبوونەوەی بە ئاسانی كۆنترۆڵ ناكرێت

یەكێكیش لە گرینگترین هۆكارەكانی بازرگانیكردن بە دەرمانی ساختە، بریتییە لەوەی كە بە پرۆسەیەكی پڕ دەستكەوت و قازانج دادەنرێت، بۆیە تۆڕە تاوانكارییەكان بە لێشاو ڕووی تێ دەكەن. بە پێی ڕاپۆرتی سەنتەری ئەمەریكی بۆ ڕاگەیاندن كە لە سەر دەرمان كراوە، بەهای فرۆشتەكانی دەرمانی ساختە ڕەنگە ساڵانە بگاتە 75 ملیۆن دۆلاری ئەمەریكی.

یەكێكی تر لە هۆكارەكان: بە ئاسانی دەستبەركردنی ئامێری تایبەتی دروستكردنی ئەو دەرمانانەیە، كە نرخیان زۆر هەرزانە بە

تایبەتی لە هیند و چین. ئامێرێک ڕەنگە نرخەکەی تەنها بکاتە (52. 000 ڕیاڵی سعوودی) کە دەتوانرێت کارگەیەکی دروستکردنی دەرمانی پێ دابنرێت. لەگەڵ هەبوونی شارەزاییەکی کەمیش لە بواری دەرمانسازی و دروستکردنی دەرمان، دەتوانن بازاڕ پڕ بکەن لە بڕێکی زۆر لەو دەرمانانەی، کە تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی دەرمانە ڕاستەقینەکەیە و بە هەمان ڕەنگ و کارتۆن و شێوازی پێچانەوەی، یان جۆری حەبەکەی، کە بە ئاسانی لە یەک دەرناکرێن و جیا ناکرێنەوە. بە تایبەتی ئەو دەرمانانەی کە لە لایەن کۆمپانیاکانی دەرمان دەفرۆشرێن، ئەوانەی تەمەنی بەکارهێنانیان بە سەر چوە.

**مەترسییەکانی دەرمانی ساختە:**

بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە دەبێتە هۆی دروستبوونی بێمتمانەیی لە سیستەمی چاودێریی تەندروستی و فرۆشیارانی دەرمانی ڕاستەقینەی تەندروستیی جیهانی دەکەونە ژێر پرسیارەوە. ملیۆنان حاڵەتی مردن بە مەلاریا تۆمار کراون، کە ڕەنگە بتوانرێت خۆمانی لێ

لابدەین گەر هات و دەرمانەکانی دەدەرێنە نەخۆشەکان ڕاستەقینە بن و ئەو مادانەیان تێدا بێت کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکە دەگونجێت.

پەتای بەرهەمە ساختەکانی سەرتاپای وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقای داگیر کردوە. بکوژێکە و دەخزێتە جەستەی هەموانەوە بێ جیاوازی، بەڵکوو تەنانەت مرۆڤ خۆی بانگهێشتی دەکات بۆ ناو جەستەی خۆیەوە. بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختە ساڵانە نزیکەی 600 ملیار دۆلار لە کۆی بازرگانیی جیهانیدا دەستبەر دەکات. ڕەنگە لە داهاتوویشدا ببێتە تاوانە هەر دیارەکەی (سەدەی 21).

دەستەواژەی دەرمانی ساختە بە پێی فەرهەنگی (بلاک قانون)، بۆ وەسفکردنی دەرمانێک دانراوە، کە کەسێک یان دەستەیەک دروستی دەکەن بە ڕێگەی لەبەرگرتنەوەی، یان لاساییکردنەوەی بەرهەمە ڕاستەقینەکە بێ ئەوەی هیچ مافێکیان هەبێت. ئەمەیش بە مەبەستی فێڵلێکردن و غەشکردن. پاشانیش بە بازاڕکردنی و فرۆشتنی بە نرخێکی خەیاڵی، گەر هات و دەرمانەکە یەکێک بوو لەو دەرمانانەی بۆ چارەسەری نەخۆشییە کوشندەکان بە کار دێت.

به گوێرەی ناساندنی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، دەرمانی ساختە (یەکێکە لەو دەرمانانەی بە ڕێگەی فێڵ و دەستبڕین بەرهەم دەهێنرێت و پاشان ناو و ناسنامە و سەرچاوەی وەهمی بۆ دادەنرێت. زۆربەی جاریش لاساییکردنەوە لە سەر هەموو ئەو بەرهەمانە جێبەجێ دەبێت، کە هێمایەکی بازرگانی و بەرهەمی گشتییان پێوەیە. ڕەنگە بەرهەمە لاساییکەرەوەکان بڕێک مادەی ڕاستودروستیان تێدا بێت، یان هەندێک جار بڕێکی کەم لە پێکهاتە وزەبەخشەکان لە خۆ بگرن.

ئـــەوەی ڕوون و ئـاشـکـرایـە، کـێـشـەی هەبوونی دەرمانی ساختە لە هەموو وڵاتێکدا بـوونـی هـەیـە: وڵاتـانـی پێشکەوتوو، وڵاتانی تازەدروستبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا مەودای ڕاستەقینەی ئەو کێشەیە زۆر بە وردی دیار نییە و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی بە داتـا و ئاماریان بۆ نەکراوە، چونکە هیچ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی زانستییانە و تێروتەسەل نەکراوە لە بارەی دەرمانی ساختە و مەترسی و ڕەهـەنـدە ئابوورییەکانی لە داهـاتـوودا. بۆ

یەکەم جاریش کێشەی دەرمانی ساختە لە ناو بازرگانیی نێودەوڵەتیدا لە کۆنگرەی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی لە ژێر ناوی (پسپۆڕانی ڕێنیشاندەری بەکارهێنانی دەرمان) لە نیرۆبیی پایتەختی کینیا لە ساڵی 1985 بوو. هەر لەو کاتەوە جۆرێک لە هۆشیاریی گشتی پەیدا بوو لە سەر کێشەی دەرمانی ساختە. دوا جار سەرجەم لایەنە حکومی و کۆمپانیای بەرهەمهێنەر هەوڵیان داوە ڕێگە بەو کێشەیە بگرن. ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییش چەندین ڕاپۆرتی سەبارەت بە دەرمانی ساختە و بازرگانیکردنی بە دەرمانەوە لە هەندێک وڵاتانی ئەندام بە دەست دەگەییشت. بە پێی ئەو زانیارییانە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو کێشەیەی بە نزیکەی سەرجەم وڵاتانی جیهانی گرتوەتەوە بێ جیاوازی، چ وڵاتانی پێشکەوتوو، چ وڵاتانی تازە پێگەییشتوو.

بە پێی نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵیی ئەمەریکیش، بازرگانیکردن بە دەرمان بە نزیکەی 600 ملیار دۆلار لە بازرگانیی جیهانیدا هەیە. زیاتر لە 46 ڕاپۆرتی نهێنی گەییشتوەتە دەست

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سەبارەت بەو دەرمانە ساختانەی لە نێوان 2000ـەوە تا 2008 لە لایەن زیاتر لە 20 وڵات، لە 60% لە وڵاتانی تازە پێگەییشتووەوە هاتوون. ئەمە لە کاتێکدا لە 40% لە وڵاتانی ترەوە هاتوە. ئەو دەرمانانەی بە شێوەیەکی یەک جار بەرچاو ساختەیان تێدا دەکرێت، بریتین لە: دەرمانی دژە چالاکییەکانی هەرمۆنات، دەرمانی ئازارشکێن، وزەبەخش، دژەهیمستاین، ئەو دەرمانانەیش بە نزیکەی لە60% کۆی بەرهەمەکانن.

**فاکتەرەکانی دەبنە هۆی**
**بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختە**

چەندین فاکتەری سەرنجڕاکێش هەن، کە بوونەتە هۆی پەیدابوونی ئەو جۆرە بازرگانیکردنە، چونکە دەرمان یەکێکە لە بەرهەمە پڕ داهاتەکان و بەردەوام داواکاریی لە سەرە. جگە لەوەیش، کەسی ئەنجامدەر ئەو دەرمانانە بە تێچوویەکی یەکجار کەم بەرهەم دەهێنێت: کەرەستەی هەرزان، یان ئەو مادانەی هیچ جۆرە مادەیەکی چالاکییان تێدا نییە.

دەرمانی ساختە جگە لەوەی توانایەکی باشتری هەیە لە فێڵکردن، بە تایبەتییش گەر لە بەری گیرایەوە بە شێوەیەکی لێهاتوانە و نیشاندانی وەک ئەوەی دەرمانێکی ڕاستەقینە بێت. جگە لەوەیش، کەسی نەخۆش خۆی جۆری دەرمان بۆ خۆی هەڵنابژێریت، بەڵکوو پزیشکان و ئەو کارمەندانەی لە بواری تەندروستیدا کار دەکەن دەرمان بۆ نەخۆش وەسف دەکەن، یان دەرمانساز، بۆیە کارمەندانی بواری تەندروستی پشکێکی زۆریان لە بە بازاڕکردنی ئەو جۆرە دەرمانانە بەر دەکەوێت، پاشانیش دەستکەوت و قازانجی خۆیان هەیە.

**دیارترین فاکتەرەکان کە هانی دروستبوونی دەرمانی ساختە دەدەن بریتین لە:**

- نەبوونی ئیرادەی سیاسی و پابەندنەبوون بە بەرهەڵستیکردنی ساختەکاری:

نابێت وەک کاڵایەکی بەکاربەر مامەڵە لەگەڵ دەرمان بکرێت، چونکە دەرمان گرینگییەکی زۆری هەیە لە سەر بەدیهێنانی ئامانجە گرینگەکان بۆ باشترکردنی تەندروستیی گشتی.

لەبەر ئەوە پێویستە وەک هەر کاڵایەکی تر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، چونکە پەرەپێدان و هەناردەکردنی و ئاڵوگۆڕپێکردنی و دانانی لە ناو زنجیرەی دابەشکردن و بەکارهێنان، پێویستی بە شارەزایانی تایبەت و بەهرەی تایبەتیش هەیە. دوا جار، پێویستە لەگەڵ پێوەرە دیاریکراوەکان بگونجێت. هەروەها پێویستە بە وردی کۆنترۆڵی کوالیتەکەی بکرێت، ئەمەیش پێویستی بە ئیرادەیەکی بەهێز و پابەندبوونی حکوومەتە بە دامەزراندن و کارپێکردنی دەسەڵاتی نیشتیمانی بە هێز و ڕێکخراوەکانی دەرمان هەیە.

• **نەبوونی یاسای تایبەت بە دەرمان:**

یاسا و لیست بریتین لە دوو بنچینەی سەرەکی بۆ ڕێکخستنەوەی دەرمان. بەڵام یاسا و لیستێکی دیاریکراو نییە بۆ کۆنترۆڵکردنی دەرمان و ساختەکردن لە دەرمانیش بە چالاکییەکی تاوانکاری هەژمار ناکرێت لە زۆربەی وڵاتان. تەنیا چەند وڵاتێکی کەم لە وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، یاسای نیشتیمانیی تایبەتیان داناوە بۆ

چارەسەرکردنی مەسەلەی دەرمانی ساختە. جگە لەوەیش، ئەو سزایانەی سەپێنراون بە سەر ساختەکاران لە زۆربەی حاڵەتدا ڕێگر نین. نەبوونی یاسای ڕێگریش هانی ساختەکاران دەدات زیاتر بەرەو ئەو کارە بچن، چونکە هیچ ترسێکی گرتن و ڕاوەدوونان و دادگاییکردنیان نییە لێی بترسن و سڵی لێ بکەنەوە.

• **نەبوونی، یان لاوازی ڕێکخراوە تایبەتەکان:**

پێویستە دڵنیایی جۆریی باش لە پێناو بەرهەمی داواکراو هەبێت. گرەنتیی بۆ ئەو تایبەتمەندییانەیش پێویستی بە دامەزراندنی دەسەلاتێکی نیشتیمانیی تایبەت هەیە بۆ چاودێریکردنی ئاستی دەرمان لەگەڵ ئەو کەرەستانەی پێویستن لە کەرەستەی مرۆیی و چەندی تریش بۆ کۆنترۆڵکردنی پیشەسازی و هاوردەکردن و دابەشکردن و فرۆشتنی دەرمان هەبێت. لە کاتی ئێستادا تەنیا لە 20%ی وڵاتانی ئەندام لە کۆی 191 وڵات لە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، ژمارەیەک ڕێکخراوی کارایان هەیە بۆ دەرمان. لە 50%یش لە وڵاتەکانی تر، ڕێکخراوی ئاست جیاجیان هەیە

له گەشەکردن و توانای کارپێکەری. له 30%
ماوەتەوە، هیچ جۆرە ڕێکخستنێکیان بۆ دەرمان
نییە، یان توانایەکی یەکجار سنورداریان هەیە و
زۆر جار هەر کار ناکات، بۆیە کاتێک چاودێریی
ڕێکخستنەوەی دەرمان وەک پێویست نابێت، یان
لاوازە، یان ناکارایە، دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی
دەرمانی ساختە له بازاڕە نیشتنمانییەکاندا.

- **لاوازی له سەپاندنی سزای تاوانکاری:**

سەپاندنی یاسای قەدەغەکردن دژی
ساختەکاری بە تەنیا کێشەکە چارەسەر ناکات،
چونکە پێویستە ئەو یاسایانە لە کاتی خۆیدا
جێبەجێ بکرێن، بۆیە دەبینین تاوان زیاتر و
زیاتر گەشە دەکات کاتێک هیچ جۆرە یاسایەک
ناسەپێنرێت و تاوانباریش دەستگیر ناکرێت و
دادگایی ناکرێت. سزای سوکیش بە هەمان شێوە
هانی تاوانی زیاتر دەدات، بە تایبەتی کاتێک
سزای ساختەکردن لە بەرهەمە ناپزیشکییەکان
سوکترە. جگە لەوەیش، فەرامۆشکردنی
مافەکانی هێمای بازرگانی، ئەوەندەی تر هانی
ساختەکاری دەدات بە شێوەیەکی فراوانتریش.

- **گەندەڵی و بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکان:**

شایستەیی کارمەندان بە سەلبی کاریگەر دەبێت بە هۆی گەندەڵی و بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکان، ئەمەیش دەبێتە هۆی جێبەجێنەکردنی یاساکان و دەربازبوونی تاوانباران لە سزاوەگرتن. حکوومەتەکانیش پێویستیان بە دانانی ستراتیژیەتە بۆ سنوردانان بۆ گەندەڵی.

- **داواکارییەکانی دەرمان سنور تێ دەپەڕێنێت:**

کاتێک داواکارییەکان بۆ دەستبەرکردنی دەرمان زۆر لەوە زیاتر دەبێت، (مافیاکان)ی ساختەکردن دێنە ناو مەسەلەکە بۆ ئەوەی سود لە دروستکردن و دابەشکردنی دەرمان ببینین. زۆر جاریش دابەشکردنی ئەو دەرمانە بە ڕێگەی کەناڵی نایاسایی دەبێت، کە سەر بە هیچ کەناڵێکی تەندروستی نین.

- **بەرزبوونەوەی نرخی دەرمان:**

کاتێک نرخی دەرمان بەرز دەبێتەوە و جیاوزاییەکی زۆر لە نێوان بەرهەمەکانی دەرماندا دەبینرێت، ئەمە دەبێتە پاڵنەرێک بۆ زیاتر دروستکردن و بەرهەمهێنانی دەرمانی ساختە و هەرزان، هەروەها کەسانی زیاتریش دەخزێنە ناو ئەو بازرگانییە

ساختەکارییە، چونکە تێچووی دروستکردنەکە زۆر کەمە و داهاتەکەی یەک جار خەیاڵییە.

- **نەبوونی هەماهەنگی:**

ئەو دەرمانانەی بۆ هەناردەکردن دروست دەکرێن، لە لایەن وڵاتانی هەناردەکراو ڕێک ناخرێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ هەمان ئاست یەک بگرێتەوە، کە بۆ بەکارهێنانی ناوخۆیی بەرهەم دەهێنرێن. جگە لەوەیش، هەندێک جار دەرمان بە ڕێگەی ئەو ناوچانە هەناردە دەکرێن، کە ناوچەی بازرگانیی ئازادن و دژایەتیکردنی دەرمانی ساختە لە ناویدا بەو شێوەیە نییە ببێتە مایەی ترس بۆ بازرگانان. لە ڕاستیدا، ناوچەی بازرگانیی ئازاد ڕەنگە ببێتە هۆی ڕەخساندنی هەلی باشتر بۆ ساختەکاران بۆ بردنەناوەوەی مادەی ناشەرعی لە زنجیرەی دابەشبوون، کە ناکەونە بەر ئاستێکی باڵای ڕێکخستنەوە و چاودێریکردن.

- **قۆرخکردنی ژمارەیەکی کەمی وڵاتان بۆ بەرهەمهێنانی دەرمانی دیاریکراو:**

ڕێگەگرتن لە بەرهەمهێنانی هەندێک دەرمانی گرینگ بە نرخێکی کەم کە لەگەڵ گەلانی جیهانی

سێیەم بگونجێت و قۆرخکردنی زۆربەی زۆر دەرمانەکان، هەروەها دانانی پەراوێزی سود و قـازانـج لـە سـەریـانـدا وا دەکـات دەرگـا لە بەردەم ساختەکردن و غەش و لاساییکردنەوە لـە جیهانی دەرمـانـدا زیـاتـر پـەرە بستێنێت، جیهانی سێیەمیش نرخی ئەو قۆرخکارییە زۆر بەقورسی دەدات.

**کاریگەری لە سەر تەندروستیی گشتی:**

زۆر بەکەمی دەرمانی ساختە ئەو مادانەی تێدایە، کە مـادەی کـاران و چـارەسـەریـان لە ناودایە. لە زۆربەی ئەو حاڵەتانەی تێیدا دەرمانی ساختە تۆمار کراون، جەخت لە سەر نەبوونی هیـچ جـۆرە مـادەیـەکـی چـالاک کـراوەتـەوە. بەکارهێنانی ئەو جۆرە دەرمانانەیش دەبێتە هۆی:

ـ مــاوەی چــارەســەر درێــژ دەکـاتـەوە و جەستەی نەخۆشەکەیش هیچ نیشانەیەکی چاکبوونەوەی پێوە دیار نابێت، دوا جار دۆخی تەندروستیی کەسەکە ئەوەندەی تر ئاڵۆز دەبێت، چونکە چارەسەرکردنی بە دەرمـانـی ساختە

ناکارایە و ڕەنگە ببێتە هۆی بەدیارکەوتنی بەکتریای دژەبەرهەڵستی دەرمانەکان، یان لەوانەیە کاریگەریی زیانبەخشی لە سەر چینێکی زۆری دانیشتوان دروست بکات، لە دۆخە هەرە مەترسیدارەکەیشدا دەبێتە هۆی مردن.

- دەبێتە هۆی دروستبوونی بێمتمانەیی لە ڕێکخستنی چاودێریی تەندروستی و بێمتمانەیی بە کارمەندانی بواری چاودێریی تەندروستی و فرۆشیارانی دەرمانی ڕاستەقینە، هەروەها بە پیشەسازیی کەرەستەی جوانکاری و دەرمانسازی.

- دانانی هێمای بازرگانیی نادروست، کە کاریگەریی سەلبی لە سەر ناو و نابانگ و پێگەی بەرهەمە ڕاستەقینەکە دروست دەکات. پاشانیش دەبێتە هۆی زیانی ملیۆنان بە خاوەنی هێمای بازرگانییە ڕاستەقینەکە. هیچ جۆرە چارەسەرێکی سادەیش نییە، کە بتوانرێت جێبەجێ بکرێت بۆ لەناوبردنی دەرمانی ساختە، هەروەها لە ڕێگەی کۆمپانیا، یان تاکە کەسێکەوە، یان حکوومەتێک بە تەنیا چارەسەری ئەو کێشە ناکرێت، چونکە لە کاتی ئێستادا ڕەهەندێکی

جیهانیی وەرگرتوە، بۆیە پێویستی بە میتۆد و چارەسەرێکی جیهانییش هەیە.

ڕێکارەکانی بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختەیش لە سەر ئاستی نیشتیمانی وا دەخوازێت، کە هەر وڵاتێک پێویستە چەندین بژاردەی گونجاوی هەبێت بۆ سیاسەت و یاسای تایبەتی بە دەرمانی هەبێت، هەروەها دانانی ستراتیژیەت و دانانی یاسای دامەزراوەیی و پیشەیی و کەرەستەی دارایی بۆ ئەو مەبەستە. لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت ئامانج لەو سیاسەتانە بەشدارپێکردنی حکوومەت و ئاژانسەکان و دروستکەرانی دەرمان و وەبەرهێنەر و دابەشکەران، دەرمانسازان، ڕێکخراوە حکومییەکان و ئەو گروپانەی بەرژەوەندیی گشتییان هەیە بگرێتەوە. جگە لەوانەیش چەندین هەوڵی تر بدرێن بۆ ڕێگەگرتن لە دروستکردن و بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختە. زۆر جاریش ئەو جۆرە ڕێکارانە کاران و لە جێگەی خۆیاندان گەر هات و سەرجەم لایەنە پێوەندیدارەکان بە یەکەوە پابەند پێیەوە و کاری بۆ بکەن.

گەر بە شێوەیەکی دیارتر ئەو ڕێکارانە

بخەینە ڕوو، دەبێت حکوومەتەکان ئیرادەی سیاسییان هەبێت و پابەند بن بە پەرەدان بە بەرنامەی بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە و جێبەجێکردنی سەرجەم ئەو بەندە یاساییانەی بۆ ئەو مەبەستە خراونەتە ڕوو. ئەو پابەندبوونەیش بە ڕێگەی چەندین هەنگاوی ڕاستەقینە ئەنجام دەدرێن.

### ئەو ڕێکارانەی پێویستە بگیرێنە بەر بۆ ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە:

| ژ | ڕێکارەکان | بۆ مەبەستی |
|---|---|---|
| 1. | دانانی یاسای نوێ بۆ دەرمان | بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە دروستکردنی دەرمانی ڕێگەپێنەدراو |
| 2. | دروستکردنی دامەزراوە بۆ ڕێکخستنی دەرمان | ئەمەیش بە شێوەیەکی ڕوون لە یاساکانی دەرمان دیاری دەکرێن |
| 3. | دیاریکردنی دەسەڵاتی دامەزراوەکان | بە مەبەستی دابەشکردنی بەرپرسیارێتی و ئەرکی ئەو دامەزراوانە |
| 4. | مەشقکردن بە کارمەندان | بەتایبەتی بۆ ئەو کارمەندانەی دەتوانن دەرمانی ساختە و ڕاستەقینە لە یەک جیا بکەنەوە |
| 5. | دەستەبەرکردنی کەرەستەی دارایی | بە مەبەستی کاراترکردن و جووڵەی زیاتر بۆ بەرەنگاربوونەوەی بازرگانانی دەرمان |
| 6. | جەختکردنەوە لە یاساکان | بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر یاساکان جێبەجێ بکرێن بە سەر ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە |
| 7. | بەهێزکردنی هاریکاریی نێودەوڵەتی | لە پێناو بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە و چوونە ناو ڕێکەوتنی فرەلایەن |
| 8. | هاریکاریی وڵاتان | بەشداریەتی لەگەڵ ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی و ئەنتەرپۆڵ و ڕێکخراوی گومرگی جیهانی (WCO) |

پێویستە ڕێکار و سیاسەتەکانی دادوەری ڕەنگدانەوەی هەبێت لە سەر ئەو مەترسی و تاوان و کێشەیەدا، دادگاکانیش دەبێت خێراتر کار بکەن لە سەر ئەو دۆسیانەی لە بارەی دەرمانی ساختەوە دێنە بەر دەستیان و سەپاندنی سزای توند بە سەر تاوانباران، جگە لەوەیش پێویستە دادگاکان دەست بە سەر ئەو شوێنانەدا بگرن کە سەرچاوەی دەرمانی ساختەن.

## ڕێکخراوەکانی تەندروستیی جیهانی:

1. **ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی**: کە کورتکراوەکەی (WCO)یـە سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان و تایبەتە بە تەندروستیی جیهانی. ساڵی 1948 دامـــەزراوە و بنکەی سـەرەکیـی لـە جنێف، پایتەختی سویسرایە.

بەرپرسە لە گێڕانی ڕۆڵێکی سەرەکی لە چارەسەرکردنی مەسەلە تەندروستییەکانی جیهانی و داهێنانی بەرنامە و توێژینەوەی تەندروستی و دانانی ڕێسا و پێوەری نوێ بۆ بواری تەندروستی.

ئامانجی ئەو ڕێکخراوە دەستبەرکردنی تەندروستییەکی ڕاستودروستە بۆ سەرجەم گەلانی جیهان. لە هەر یەک لە وڵاتانی ئەفریقا و ئەورووپا و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا و هەر دوو ئەمەریکاکە بارەگای هەیە.

2. **تیمی (ئیمباکت) نێودەوڵەتی:**

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی پێشنیاری دامەزراندنی تیمێکی کاری کرد Intarnational Medicinal products Anti_ Counterferfeiting Taskforce. IMPACT کە تیمێکی نێودەوڵەتییە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ساختەکردنی بەرهەمی پزیشکی (ئیمباکت) کار دەکات لە سەر ئەو دامەزراوانەی هەن و دەستەی تایبەت و گشتی و نێودەوڵەتی کۆ دەکاتەوە لە پێنج تەوەردا:

1. **بواری تەکنیکی:** ئەو تەوەرە لە لایەن پیشەسازیی و ڕێکخەرانی دەرمان سەرپەرشتی دەکرێت، ئەو تەوەرە تا ڕادەیەکی زۆر پێش کەوتوە، بەڵام بە هۆی جیاوازیی تەکنیکیی نێوان وڵاتان پێویستی بە گواستنەوەی تەکنەلۆژیایە.

2. **یاسادانان:** پێداچوونەوە بە یاسا نێودەوڵەتییەکان و پێشکەشکردنی نموونەی باش و کارا، هەروەها گەڕان بە دوای فاکتەری هەماهەنگیکردن و نزیکبوونەوە لە ڕووی یاساییەوە، ئەو تیمە یارمەتیدەرن بۆ پێداچوونەوە بە یاساکان بۆ ئەوەی پۆلیسی گومرگەکان و دادوەران بتوانن مامەڵە لەگەڵ دەرمانی ساختە و ساختەکاران بکەن.

3. **جێبەجێکار:** دۆزینەوەی میکانیزم بۆ کارکردن لە نێوان گومرگ و پۆلیس و دادگا لە سەرجەم وڵاتان بۆ چاودێریکردنی سنورەکان و بەدواداچوون بە ڕێچکەی کەرەستە ساختەکان و دەستبەسەرداگرتنیان، بۆیە بەردەوام ئەو تیمە بە دوای میکانیزم و ڕێگەچارەی نوێدا دەگەڕێت بە ڕێگەی سیستەمی زانیارییەکان، کە لە سەر لایەنی تەکنیکیی زانیارییەکان. بۆ ئەو مەبەستەیش سوود لە ڕێکخراوی گومرگەکانی جیهانی و ئەنترپۆل وەردەگرن.

4. **ڕێکخستن:** دۆزینەوەی میکانیزم و ڕێگەچارە بۆ ڕێکخەرانی دەرمان بۆ ئەوەی کار بکەن و بتوانن ڕێکارە یاساییەکانی گیراونەتە

بەر دژی دەرمانی ساختە جێبەجێ بکەن، لەوانەیش گرەنتیی پێوەرەکانی شایستەبوون و دڵنیایی و کارایی و ڕێکخستنی دابەشکردنی دەرمان بە شێوەیەکی یاسایی و دوور لە هەر ساختەکارییەک.

5. **بەردەوامبوون لە کاتە مەترسیدارەکان:** هۆشداریدان و وەڵامدانەوە. کەی لەگەڵ جەماوەر پێوەندی دەکەین و ئاگاداریان دەکەینەوە لە بوونی هەر مەترسییەک لە کەرەستەی ساختە لە ناو کۆمەڵگە ناوخۆییەکاندا؟

**دەرمانی ساختە پەتاکەی ئەفریقا و ئاسیا:**

بە پێی ڕاپۆرتەکان، پەتای دەرمانی ساختە سەرتاپای ئاسیا و ئەفریقای گرتوەتەوە، بە تایبەتی ئەو دەرمانانەی زۆر پێویستن بۆ ڕزگارکردنی ژیانی نەخۆشەکان، وەک دەرمانی مەلاریا. دەست بە سەر بڕێکی زۆر لە دەرمانی ساختەدا گیراوە کە ڕێژەکەی دەگاتە نزیکەی 53% لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا. هەروەها دەست گیراوە بە سەر بڕێکی زۆر دەرمانی ساختە لە جۆری دژە دەرمانی چالاک

و دەرمانی چارەسەری سیل و ئایدز و تەنانەت دژە هەوکردنی مێشیک.

لە ئەفریقایش بە پێی توێژینەوەکان دەرکەوتوە لە نێوان 30ــ 40% دەرمانی ساختە هەیە. پێش چەند ساڵێک بە دەیان منداڵ گیانیان لە دەست دا بە هۆی دەرمانێکی ساختە کە مادەیەکی نەوتی تێدا بوو.

ساڵانە بە هۆی دەرمانی ساختەوە دووسەدهەزار کەسی تووشبوو بە مەلاریا گیان لە دەست دەدەن. ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیش ڕێژەکە بە ملیۆن حاڵەتی مردن بە مەلاریا مەزەندە دەکات، کە ڕەنگە بتوانرێت ڕێگەی پێ بگیرێت گەر هات و دەرمانی ڕاستەقینە بە کار بهێنرێت بۆ نەخۆشەکان و پێدانی بە نەخۆش بە شێوەیەکی ڕاستودروست.

ئەوەی بوەتە مایەی مەترسی سەبارەت بە دەرمانی ساختە ئەوەیە، کە لە ماڵان و بە بڕ کەم بەرهەم ناهێنرێت، بەڵکوو لە چوارچێوەیەکی پیشەسازیی فراواندا دەکرێت، بە گوێرەی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی لە 30% دەرمانەکانی لە وڵاتانی جیهانی

سێیەم دابەش دەکرێت، دەرمانی ساختەن و هیچ مادەیەکیان بۆ چارەسەری نەخۆش تێدا نییە. ئاسانیش نییە ڕادەی بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە دیاری بکرێت، بەڵام ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی بە لە نێوان 1% لە وڵاتانی پێشکەوتوو، زیاتر لە 30% لە هەندێک وڵاتانی تازەپێگەیشتوو. تا ساڵی 2010 قەبارەی ئەو بازرگانییە گەیشتوەتە نزیکەی 55. 5 ملیار یۆرۆ، ژمارەی دەرمانی لاساییکەرەوەیش، کە لە ئەوروپادا دەستی بە سەردا گیراوە، گەیشتوەتە نیو ملیۆن بەرهەمهێنەر. لە لایەکی تریشەوە، بەرەوپێشەوەچوونی بواری بازرگانیی ئەلکترۆنیش ئالینگارییەکی تری خستوەتە سەر ئەو کێشەیە لە جەنگی دژی دەرمانی ساختە. چونکە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی فرۆشتنی دەرمانی ساختە بە ڕێگەی ئەنتەرنێت بە 50% مەزەندە دەکات.

دەرمانی ساختە هاوشێوەی بازرگانیکردنە بە مادەی هۆشبەر و مرۆڤ، چونکە بەهای پیشەسازیی دەرمانی ساختە ساڵانە بە دەیان ملیار یۆرۆ مەزەندە دەکرێت و هەموو ساڵێکیش زیاتر دەبێت.

ئۆفیسی نەتەوە یەکگرتووەکانیش، کە تایبەتە بە مادەی هۆشبەری و تاوان جەختی کردەوە کە ساڵی 2013 بازرگانییەکی نایاسایی بە خۆیەوە بینیوە لە دەستەبەرکردنی دەرمانی ساختە کە بە 75 ملیار یۆرۆ مەزەندە کراوە.

لە چەندین وڵاتانی ئەفریقی دا دەستگێرەکان بە ئاشکرا دەرمان دەفرۆشن و بە ملیۆنان تەن دەرمان لە بەندەرەکانی ئەفریقاوە دەگوازرێنەوە. دەرمانی ساختە بە تەواوی کیشوەرە ڕەشەکەی داپۆشیوە، تەنانەت گومرگەکانی حکوومەتیش ناتوانن کۆنترۆڵی بکەن و لە ناوی ببەن. چونکە بەدرێژاییی چەندین ساڵە دەرمانی ساختە بوەتە تارماییيەک و گیانی هەزاران کەس لە دانیشتوانی ئەو کیشوەرە قوت دەدات. بیروڕای جیاوازیش لە سەر جۆری ئەو دەرمامانە هەن: (ئەو کاڵا و بەرهەمانەن کە بە مەبەستی فێڵ و دەستبڕینی خەڵکی نەخۆش دەگۆڕرێن، چ لە ڕووی ناسنامە یان سەرچاوە یان خودی پێکهاتەکانی ئەو دەرمانە، یان دانانی لە ناو پاکەتی ساختە یان پیسبوو) هەندێکیش پێیان وایە (دەرمانی ساختە: ئەو دەرمانەیە کە بە

مەبەست ساختە لە ناو و پێکهاتە و سەرچاوەیدا دەکرێت. هەروەها ئەو دەرمانانەیش دەگرێتە کە پێکهاتە ڕاستەقینە و ناڕاستەقینەیان تێدایە، یان بێ هیچ کەرەستەیەکی کاران، یان کەرەستەی کارای ساختە) بەڵام دەرمانی لاساییکەرەوە، واتە فێڵکردنە لە هێمایەکی بازرگانیی بەناوبانگ، ڕەنگە هەندێک جار ئەو دەرمانە تا ڕادەیەک بڕێک لە کەرەستەی کارای تێدا بێت، بەڵام زۆر بەکەمی.

بە پێی ئامار و ڕاپۆرتەکان کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییش بڵاوی کردوەتەوە، هیندستان بە ڕێژەی 75% سەرچاوەی ئەو جۆرە دەرمانەیە و چین بە پلەی دوەم دێت، نێجیریایش وەک هەمیشە دەرگا واڵاکەیە بۆ هاتنی ئەو جۆرە دەرمانە بە تێکڕایی 35%.

**مۆریتانیا: نموونەی دیاترین وڵاتی ئەفریقا لە دەرمانی ساختەدا:**

بە پێی ڕاپۆرتەکانی پەیمانگای توێژینەوە دژی ساختەکردنی دەرمان (IRACCM)ی فەرەنسی، مۆریتانیا بوەتە گەورەترین سەرچاوەی

دابەشکردنی دەرمانی ساختە لە خۆرئاوای ئەفریقا.
بە دەیان و سەدان تەن لەو جۆرە دەرمانانە دەگەنە بازارەکانی مۆریتانیا لە هەموو ساڵێکدا و لە ناو وڵاتدا دابەش دەکرێن و دواتر دەگەنە وڵاتانی تری ئەفریقا. ساختەکردنی دەرمان لە مۆریتا هەر لە ساڵی 2004ـەوە بە شێوەیەکی یەکجار بەرچاو پەرەی سەندوە، ئەمەیش دوای دەرچوونی یاسایەکی نوێ بوو بە کردنەوەی دەرمانخانە بۆ فرۆشتنی دەرمان بەو مەرجەی کەسەکە بڕوانامەی دەرمانسازیی هەبێت. دەیان تۆڕی تاوانکاری چالاکن و ساختە دەکەن لەو دەرمانانە و نرخەکەیان خەیاڵییە، هەر لە دەرمانی پاڵەپەستۆی خوێن و بێهۆشکردن تا کەمترینیان. دەرمانسازانی مۆریتانیش جەخت لەوە دەکەنەوە، کە بە شێوەیەکی لێهاتوانە ساختە دەکرێت لە دەرمان و زۆر ئەستەمە بتوانین ڕاستیوناڕاستی دەرمانەکە لە یەک جیا بکەیتەوە، گەر دەرمانەکە نەخرێتە بەر تاقیگە. بازرگان و مافیاکانی ئەو تاوانە بە ڕێگەی قاچاخ و نایاسایی ئەو کارە ئەنجام دەدەن، کە هەر لە مۆریتانیاوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە کوناکری و گینیا و بیساو.

بازاڕەکانی گینیا و کوناگری یەکێن لە گەورەترین خاڵی ئاڵوگۆڕکردنی دەرمانی ساختە، چونکە دەلاڵەکان لەو بازاڕانەدا کۆ دەبنەوە، ئەوانەی لە چین و هیندستان و نێجیریا و گانا و ساحل عاجەوە بۆ ئەو مەبەستە دێن، هەر بە پێی ڕاپۆرتی ئاژانسی (هەواڵ)ی فەرەنسی، (بازرگانانی مردن لە مۆریتانیا ساڵانە هەزاران کەس دەکەنە قوربانیی ئەو بازرگانییەیان بێ ئەوەی کەس بە شێوەیەکی فەرمی باسی لێوە بکات، یان بەرپرسیارێتییەکە دیاری بکەن و تاوانباران بخەنە بەر زوومی تاوانبارکردن). ساڵانە زیاتر لە 100 هەزار کەس دەبنە قوربانیی دەرمانی ساختە. بە پێی سەرژمێریی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییش لە نێوان 30% بۆ 70% دەرمانەگانی لە ئەفریقا دەفرۆشرێن ساختەن و هیچ مادەیەکی کارا لە خۆ ناگرن، بۆیە ڕۆژانە 2000 کەس دەمرن. ئەمە جگە لە زیانی کەرتی دەرمان کە ساڵانە دەگاتە 70بۆ 75 ملیار دۆلار ساڵانە.

**هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە:**

- ڕووکردنە بازرگانیی ئازاد وای کردوە جووڵەکردنی بازرگانیی ئەو جۆرە تاوانە ئاسانتر بێت و دەستبەسەرداگرتنیشی لە گومرەکان قورستر بێت.

- یاساکان نەگونجاون بۆ ڕێگەگرتن لە ساختەکاری.

- داواکاریی بەردەوام بۆ دەرمان، هەروەها بەکارهێنەریش جیاوازی ناکات لە نێوان دەرمانی ڕاستەقینە و ساختە.

- دڵنیاییی تەندروستی لە زۆربەی وڵاتان نییە، بۆیە نەخۆش هەمیشە بە دوای دەرمانی هەرزانترە.

- چاودێریی ڕێکخستنەکان لاوازە لە زۆربەی وڵاتان، بە تایبەتیش لە کەناڵەکانی دابەشکردنی دەرمان.

- ئینکارکردنی بوونی کێشە، چونکە حکوومەتەکان دان بە هەبوونی دەرمانی ساختە دانانێن. کۆمپانیانیش، کە هیچ کاتێک دوودڵ نابن لە هەبوونی لەبەرگیراوەیەکی ساختە لە بەرهەمەکانیان ئەوەندەی تر کێشەکەی گەورەتر کردوە.

## پۆلێنکردنی دەرمانی ساختە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی:

| ژ | جۆرەکانی دەرمانی ساختە | زیانەکانی |
| --- | --- | --- |
| 1. | دەرمانی ساختە | هەڕەشەیەکی گەورە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ دروست دەکات بە تایبەتی بۆ ئەوانەی نەخۆشیی درێژخایەنیان هەیە وەک (شەکرە و پەلەپەستان) |
| 2 | دژە دەرمانە چەپاڵەکە ساختەکان | ڕێژەی کەمتر لە پێویستی لە مادەی تەواوەی تێدایە بۆ چارەسەرکردن کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەخۆشییە ڤایرۆساوییەکان |
| 3 | ئەو دەرمانە ساختانەی مادەی تەواو یان مادەی زەهراوییان تێدایە | دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی تەندروستی، لەوانەش سستبوونی گورچیلە و کێشەی هەرسی کەبەد |
| 4 | زیانی ئابووری بە هۆی دەرمانی ساختەوە | زیان بە هەموو هاوڵاتییەک و کەرتێکی تەندروستی دەگەیەنێت |
| 5 | کاریگەربوون لە سەر فرۆشتنی کۆمپانیاکان و کارگەکانی دەرمان | هۆکاری زیانپێگەیاندن بە کۆمپانیاکان بە هۆی دەرمان و بەرهەمی ساختەوە |
| 6 | لەدەستدانی متمانە | نەمانی متمانە بە سیستەمی تەندروستی و لایەنی پەیوەندیدار |
| 7. | هەستکردن بە خەتەر | بەتایبەتی لای چینی هەژار لە ناو کۆمەڵگە |

یاسای ئەمەریکی دەرمانی ساختە بەو شێوەیە دەناسێنێ، کە: ئەو بەرهەمانەی لە ژێر ناوی بێمۆڵەتەوە دەفرۆشێن لە لایەن دەسەڵاتدارانی پێوەندیداری سەرپشک بۆ ئەو مەبەستە.

لە ژێر وەسفی (غەشی دەرمان) هەموو جۆرە دەستکارییەک لە پێکهاتە و ڕادەی مادەی

دەرمانە کاراکان دەکرێت، چونکە لەوانەیە ئەو دەرمانە هیچ مادەیەکی کارای تێدا نەبێت، یان زۆر بە کەمی تێیدا بێت. ئەمەیش وا دەکات نەخۆشەکە چارەسەر نەکرێت، یان هەر هیچ چارەسەر نەبێت. هەروەها غەشی دەرمان، ناوی ساختەیش لە دەرمانی بازرگانی دەگرێتەوە (براند) و ناوی زانستی (الجنریک) دەگرێتەوە، بۆیە جۆرەکانی دەرمانی غەشکراو جیاوازییان هەیە و ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییش ئەو جۆرە دەرمانانە بە چەندین جۆر پۆلێن دەکات:

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی دەرمانی ساختە بە سەر چەندین جۆر پۆلێن دەکات، دیارترینیشیان، دەرمانی دۆرزن (بێ هیچ پێکهاتەیەکی دەرمانی کارا)، دەرمانی لەبەرگیراوە (بە ڕێژەیەکی کەم لە کەرەستەی کارا)، دەرمانی بەسەرچوو (ماوەی بەکارهێنانی بە سەر چوە) دەرمانی قەدەغەکراو (جەخت لە مەترسییەکانی کراوەتەوە و بەکارهێنانی قەدەغە کراوە)، دەرمانی لاسایکەرەوە (کارتۆنی ساختە)، دەرمانی ساختە (بەو شێوەیە دەفرۆشێت، کە گژوگیای سروشتییە).

**1. دەرمانی درۆزنە (بێ هیچ پێکهاتەیەکی کارا):**

ئەو جۆرە دەرمانە هیچ جۆرە مادەیەک لە خۆ ناگرێت، کە سودی هەبێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش، کە بێ ئەوە بە دەرمانێکی ئامادەکراو هەژمار ناکرێت، چونکە ئەو دەرمانانە هیچ پێکهاتەیەکی کارا لە خۆ ناگرن. زۆربەی جاریش هیچ جۆرە سودێکی چارەسەرکردنیان نییە، بەڵکوو هەندێک جار دەبنە ڕێگریش بۆ وەرگرتنی چارەسەری ڕاستەقینە، یان تەنانەت مردنیش.

لە لایەکی ترەوە، ڕەنگە بەکارهێنانی دەرمانی درۆزنە ڕێگر بێت لە هاتنەناوەوەی دەرمانی تر و بەمەیش ئەو هەلە زێرینەت لە دەست دەچێت بۆ چارەسەر. دوا جاریش نەخۆش بە ناچاری سەردانی پزیشک بکاتەوە لە قۆناغێک لە قۆناغەکان.

ساڵی 1995 هەزاران نێچیری بە بێ دەنگی گیانیان سپارد بە هۆی دەرمانێکی ساختە بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی توێکڵی مێشک.

ڕەنگە دەرمانی درۆزنە نەک هەر هیچ چارەسەرێکی نەخۆشەکە ناکات، بەڵکوو دەبێتە

سەرچاوەی نەخۆشییەکی تر لە بریی ئەوەی ببێتە چارەسەر. یەکێکیش لەو دەرمانە ساختانە، ئەوەی (نیک وای ت) مامۆستا ئاسیاییەکەی لە دەرمانی ئیستوائی ئاشکرای کرد، لە زانکۆی ماهیدول لە بانکۆک و ئۆکسفۆردی بەریتانی، کاتێک گوتی: (سالانی ڕابردوو بازاڕەکانی میانمار و کەمپۆدیا و تایلاند و لاوس و ڤێتنام پڕ کراون لە دەرمانی مەلاریا، بەڵام بە هۆی ئەو تاقیکردنەوانەی لە سەر هەمان دەرمان کراون، دەرکەوت لە 36% هیچ پێوەندییەکی بە نەخۆشیی مەلاریاوە نییە. ژمارەیەکی زۆریش لە تووشبوان مردن.

لە مەکسیکیش جۆرە مەرهەمێکی سووتان ئاشکرا بوو، کە لە وردەدار و قاوە دروست کرابوو.

لە چین دەسەلاتداران ئاشکرایان کرد، کە دەرمانی ڤێرتەرنەریی ئاژەڵان بۆ مرۆڤ بە کار هاتوە، هەروەها لەگەڵ جۆرە دەرزییەک کە بە دەم بە کار هاتوە. لە ئاسیایش حەبی منداڵنەبوون فرۆشراوە کە هیچ کاریگەرییەکی نەبوە!

**2. دەرمانی لەبەرگیراوە (بە ڕێژەی کەم لە مادەی کارا):**

غەشەکە لە پیشەسازیی ئامادەکراو و پێکهاتەکانی دەکرێت، ئەو دەرمانە مادەیەکی کارای تێدایە. بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر لەوەی پێویستە لە ناویدا هەبێت. ئەو جۆرەیش لە هەر هەموویان بەربڵاوترە. ڕێژەی پێویستی لە مادەی چارەسەر تێدا نییە کە نەخۆش پێویستیەتی بۆ چاکبوونەوە، یان خۆ پاراستن لە تووشبوونی بەو نەخۆشییە. ڕەنگە دەرمانەکە هەمان ئەو خەسڵەتانەی تێدا بێت کە لە ڕاستەقینەکەدا هەیە و بە هەمان ڕێژەیش، بەڵام گرەنتی لە کاراییدا نییە. ئەو جۆرە دەرمانەیش لە هەندێک لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و نێجیریا و ژمارەیەک وڵاتی ئەورووپی هەیە. بێگومان بوونی ئەو جۆرە کارگانەیش ناکەوێتە ژێر هیچ چاودێرییەکی دەرمانی.

**3. دەرمانی لاساییکەرەوە (کارتۆنی ساختە):**

کەرەستەکە بە یەکێکی تر دەگۆڕرێتەوە، یان کاریگەریی کەمترە و بە ڕێگەیەکی شارەزایانە دروست دەکرێت، وەک ئەوەی ڕاستەقینە بێت. ئەو جۆرەیش لە هەموویان مەترسیدارترە

بە هۆی نەبوونی گرەنتی لە سەر چۆنێتیی دروستکردنی.

ڕەنگە ئەو جۆرە دەرمانە لاسایيکەرەوەيش، يەکێک بێت لەو دەرمانانەی لە جيهانيدا ناوبانگێکی زۆری هەيە، بەڵام لەگەڵ ئەوەيشدا چاودێريکردنی زۆر گرينگە، چونکە هەندێک لە ساختەکاران و بازرگانانی دەرمان دەتوانن بە ئاسانی لاسايیی هەر جۆرە دەرمانێکی جيهانی بکەنەوە لە ڕووی شێوە و کارتۆن و بەرگی دەرەوەی. گەر کەسێکی شارەزا نەبێت ناتوانێت بەراوردیان بکات و لە يەکيان جيا بکاتەوە.

ڕێکخراوی تەندروستيی جيهانيش ڕای گەياند، کە لە زياتر لە 28 وڵات دەست گيراوە بە سەر ئەو جۆرە دەرمانە و بەرپرسيارێتيی مردنی ژمارەيەکی زۆری خەڵکی خست ئەستۆی ئەو کەسانەی بازرگانی بەو دەرمانانە دەکەن.

لە ئۆکتۆبەری ساڵی 2003، ترس و دڵەڕاوکێيەکی زۆر لە نێوان نەخۆش و بەرپرسانی تەندروستی لە ئەمەريکا بڵاو بووەوە، پاش هۆشدارييەکەی ئيدارەی خۆراک و دەرمان لە بارەی هەبوونی ژمارەيەکی زۆر

له قوتوی ساختەکار لە بازاڕەکان بۆ دەرمانی (بیروکریت) بۆ چارەسەرکردنی کەمخوێنی. ئیدارەکە ڕای گەیاند: خواردنی سێ دڵۆپ لەو دەرمانەی پیسبوە بە بەکتریا، مەترسییەکی گەورە لە سەر ژیانی نەخۆش پەیدا دەکات، چونکە ئەو جۆرە دەرمانە لە بنەڕەتدا بە کار دێت بۆ بەرهەمهێنانی خرۆکە سووری خوێن بە تایبەتی لای تووشبوان بە نەخۆشیی شێرپەنجە. بە پێی ڕاپۆرتی ئەو ئیدارەیە، ئەو دەرمانە خاڵی بوە لە هەر جۆرە چارەسەرێک و تەنیا بۆ مەبەستی قازانج و دەستکەوت دروست کراوە.

**4. دەرمانی بەسەرچوو (ماوە بەسەرچوو):**

دەرمانی ئامادەکراو مادەی پێویستی تێدایە، بەڵام ناکەوێتە ژێر ڕێکاری چاودێریی جۆریەتی و شایستەیی و ڕێکاری دڵنیابوونەوە. زۆربەی جار مادەی دەرمانی بۆ چارەسەر تێدایە، بەڵام ماوەکەی بە سەر چوە. کارگەی شاراوە و ناسنامە ناڕوون بڕێکی زۆر زۆر لە داوودەرمان کۆ دەکەنەوە، کە پێشتر دەرمانی چارەسەری کارا بوون، بەڵام ماوەی بە سەر چوە و دووبارە

بەرگێکی بۆ دروست کراوەتەوە و بە مێژووی نوێ مۆر کراوە و ڕەوانەی وڵاتانی هەژار کراوە. بەو جۆرە دەرمانە نەخۆش نەک هەر چاک نابێتەوە، بەڵکوو تووشی چەندین نەخۆشیی تری مەترسیدار دەبێتەوە.

**5. دەرمانی ساختە (بە دەرمانی گژوگیا دەفرۆشێت):**

دەرمانی ساختە دەفرۆشرێتە هاوڵاتی بەو پێیەی گژوگیایەکی چارەسەرکردنە، بەڵام تەنیا دەرمانێکی ئاساییە و هیچ جۆرە گژوگیایەکی تێدا نییە.

ئەو جۆرە لە دوکانی عەتار و ماڵانی تەندروستیی بێ مۆڵەت بڵاو دەبنەوە و بە دەرمانی گژوگیا بە خەڵک دەفرۆشرێن، بەو پاساوەی کە سروشتین و هیچ مەترسییەکیان لە سەر نییە، ئەمە لە کاتێکدا هەندێک گژوگیا لەگەڵ دەرمانی تر تێکەڵاو دەکەن، زۆربەی جاریش دەرمانەکان ماوەیان بە سەر چوە، وەک دەرمانی چالاکبوونی سێکس.

ئەو جۆرە ساختەکارییە مەترسی بۆ سەر تەندروستیی نەخۆش دروست دەکات و هەڕەشە لە ژیانی دەکات، چونکە دەبێتە هۆی دروستبوونی کاریگەریی خراپ. بۆ نموونە: لە ساڵی 2001

کۆمپانیای ئیقلیمی گوانسی چینی دەرمانێکی فرۆشت، گوایە گژوگیای هوانگبایە، بەڵام لە ڕاستیدا تەنیا چەند دەرمانێکی ماوەبەسەرچوو بوو، ئەو جۆرە دەرمانە بوە هۆی لەهۆشخۆچوونی ژمارەیەم زۆر لە هاوڵاتییان.

لە لایەکی تر، جۆرە دەرمانێک هەن وا لە مرۆڤ دەکات ئالوودەی ببێت، ئەمە جگە لە دروستبوونی نەخۆشییەکانی دڵ و پاڵەپەستۆی خوێن، چونکە هیچ جۆرە ئاگادارکردنەوەیەک لە سەر دەرمانەکە نانووسرێت، ئەوەی گرینگە لای بازرگانان تەنیا داهات و دەستکەوتە.

**6. دەرمانی قەدەغەکراو**

**(مەترسییەکانی سەلمێنراون و قەدەغە کراون):**

ئەو دەرمانە لە چەند پێکهاتەیەکی کیمایی پێک دێت، کە جەخت لە سەر مەترسی و زیانە تەندروستییەکانی دەکاتەوە. لە وڵاتانی پێشکەوتوو قەدەغە کراوە، بەڵام لە وڵاتانی جیهانی سێیەم و وڵاتانی تازەدروستبوو، ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێت، لە ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانیدا هەندێک نموونە هەن لە سەر ئەو دەرمانە:

دەرمانی دژە سکچون، کە دەرکەوتوە مادەی

(کلیوکینول) تێدایە، سەلمێنراوە کە هۆکاری تووشبوون بە زیانێکی زۆری مێشکە، کەچی تا ئێستایش لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بە کار دەهێنرێت.

ڕەنگە دەرمانی بەقاچاخبرراو، غەشی تێدا نەکرابێت لە ڕووی پێکهاتە ڕێژەی مادەی کارای لە ناویدا، یان لەوانەیە دەرمانەکە دانیشی پێدا نرابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ لە مەترسییەکانی کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو جۆرە دەرمانە بە قاچاخبراوانە ناکەونە بەر هیچ جۆرە چاودێرییەک و زۆر جاریش ماوەیان بە سەر دەچێت بە هۆی هەڵگرتنیان. لەبەر ئەوەی پرۆسەی بەقاچاخبردن بە ڕێگەی ئۆتۆمبێل یان بە فرۆکەی بێ ئامێری ساردکەرەوە دەگوزرێتەوە. هەندێک جۆرە دەرمان هەیە پێویستە لە شوێنی سارد هەڵبگیرێن. یان هەندێک دەرمان بە هۆی پێکهاتەی کیمیاییەکەی و ماوەی زۆری هەڵگرتنی بە تەواوی تێک دەچێت، بۆیە هەمیشە دەرمانی بەقاچاخبراو مەترسییەکانی یەکجار زۆرە.

دەرمانە ساختەکارەکان یەکێکە لە کێشە تەندروستییە گشتییە هەرە مەترسیدارەکانی، کە

گیانی خەڵک تووشی مەترسیی لە ناوچوون دەکات و ئەرکەکانی سیستەمی تەندروستیش دەخاتە بەر گومان و ناڕاستگۆیی. جگە لەوەیش، متمانە بە کەرتی تەندروستی کەم دەکاتەوە بە هۆی ئەو زیانە ڕاستەوخۆیانەی بە مرۆڤ دەیگەیەنێت.

لە زۆربەی زۆری وڵاتانیش، بە تایبەتی وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهان و سەرجەم هەرێمەکانیش، بەرهەم و دەرمانی پزیشکیی ساختە ئاشکرا کراون بە چوارچێوەیەکی زۆر فراوانیش. ئاسانیش نییە بتوانین مەزەندەیەکی ورد و ڕاستودروستمان هەبێت لە سەر دەرمانی ساختە لە بازارە نیشتیمانییەکان، بەڵام ڕۆژانە حاڵەتەکان تۆمار دەکرێن. جگە لەوەیش شێوازی ساختەکردن تەنانەت لە سادەترین وێنەیشیدا پەیوەستە بە یەک جاری بەرهەمهێنان لانی کەم، ئەمەیش مانای دروستکردنی هەزاران حەب و دەرمان دەگەیەنێت. هەر چەندە دەسەڵاتدارانی ڕێکخستنی دەرمان لە زۆربەی وڵاتانی ئەندام درکیان بەو کێشەیە کردوە، بەڵام بەئاسانی زانیاری نایەنە بەر دەست. بەڵکوو زۆر جار ڕاپۆرتەکان دەبنە مایەی سەرلێشێواندن. یەکێکیش

له گرینگترین كەموكورتییەكانی لەو بارەیەوە هەیە، لە نێوان داهێنان و مارکە بازرگانییەکان و لـە جیـاكـردنـەوەی پێشێلكارییەكانی مافی خاوەندارێتی و ساختەکردنی ڕاستەقینە. زۆر جاریش زانیاری لە سەر وڵاتی بەرهەمهێنەری دەرمانی ساختە پێشکەش ناکرێت.

لێرەدا چەندین فاكتەری گرینگ هـەن، كە بـەشـداره لە ڕەخساندنی ژینگەی سیاسی و ڕێکخراوەیی، كە یارمەتیدەرن بۆ گەشەسەندنی پیشەسازیی دەرمانی ساختە و بازرگانیكردن پێیەوە:

- دان نـەنـان بـە هـەبـوونـی ئـەو كێشـەیـە، یـان مەترسییەكانی ئـەو دیـاردەیـە لـە لایـەن حكوومەتەكانەوە.

- نەبوونی چوارچێوەیەكی یاسایی و سزای پێویست بۆ ئەنجامدەرانی.

- لاوازیـــی ڕێـكــاره ئـیـداریـیـەكـان و وردنەبوونەوەی لە سەر بەرەنگاربوونەوەی بەرهەمە ساختەكان.

- ناكارایی چاودێریكردنی دروستكردنی بـەرهـەمـە پزیشكییەكان و هـاوردەكـردنـی و دابەشكردنی.

ـ لاوازیی هاریکاریکردن له نێوان دەسەڵاتداران و دامەزراوەکانی پێوەندارن بە ڕێکخستن و چاودێریکردن و لێکۆڵینەوە لەو بارەیەوە.

ـ لاوازی لە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری لە نێوان کەرتی گشتی و کەرتی تایبەت.

ـ کەم سوودوەرگرتن لە خزمەتە تەندروستییەکان و کەناڵەکانی دەستەبەرکردنی دەرمانی ڕاستەقینە لە دەرمانسازە متمانەپێکراوەکان.

ـ نەخوێندەواری و هەژاری.

ـ کەمتەرخەمی لە سیستەمی پاراستنی کۆمەڵایەتی.

ـ پەیڕەوکردنی سیاسەتەکانی لە بارەی دەرمان هەن، کە زۆر جار زاڵە بە سەر لایەنی ئابووری لە سەر ئەستۆی تەندروستیی گشتی.

ـ پەرتەوازەیی لە کەناڵەکانی دابەشکردن.

ـ دانەنانی کۆتوپێوەند لە سەر بازرگانیکردن بە ڕێگەی ئەنتەرنێت.

## لێکەوتە ئابووری و
## کۆمەڵایەتییەکانی دەرمانی ساختە

دەرمانی ساختە و ئاست نزم، تێچووی سەر نەخۆش و سیستەمی تەندروستی زیاتر دەکات. دەرمانەکانیش نرخیان یەکجار گرانە، بۆیە هەم نەخۆش و هەم حکوومەت پارەیەکی زۆریان لە دەرمانی بەسەرچوو، یان ناکارا بە هەدەر دەڕوات.

هەبوونی ئەو جۆرە دەرمانانە متمانە بە سیستەمی تەندروستی و سەرجەم دامەزراوە

گشتییەکان کەم دەکاتەوە. زۆر جاریش دەرمانی ساختە لە کار و کردەوەی مافیا تاوانکارییەکانە. بە داهاتی ئەو جۆرە بازرگانییەیش، تاوانی تر ئەنجام دەدەن، وەک کڕینی چەک و جبەخانە و گواستنەوەی بۆ ناودەستی بەرپرسانی گەندەڵ. قوربانییان دەرمانی ساختەیش زۆر جار هەست بەوە ناکەن، بۆیە هیچ کاتێک قەرەبوو ناکرێنەوە. لە زۆر لایەنی تریش بازرگانیکردنی بە دەرمانی نایاسایی، دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە پێکهاتەی سیاسی و لاوازکردنی، کە ڕێگەخۆشکەرە بۆ بڵاوبوونەوەی هەژاری و تاوان.

**قەبارەی کێشەکە:**

ئاسان نییە بتوانین بار و قورسایی کیشەی دەرمانی ساختە و ئاستنزم بۆ سەر دانیشتوان بپێوین، بۆ ئەوەی وردتر بینەوە لەو کێشەیە، دەتوانین دوو دەستەی سەرەکی لە دەرمانی ساختە لە یەک جیا بکەینەوە. یەکەمیان: دەرمانی ساختە هەیە و پابەند نییە بە هیچ جۆرە بەندێکی لە دەستووری دەرمان، یان لە ناو دۆسیەی کۆمپانیای بەرهەمهێنراودا هاتوە.

دەستەکەی تریش: بەرهەمە نایاسایییەکانن، کە ئەوانیش دەرمانی ساختەن و زانیاری نادروست لە سەر ناسنامە، یان سەرچاوەی دەرمانەکە لە بەر دەستدا نییە. ولاتانی زۆریش هەن کێشەیان لەگەڵ دەرمانی تۆمارنەکراودا هەیە، ئەویش ئەو دەرمانانەن کە لە ولات مۆڵەتیان پێ نەدراوە.

**لێکەوتە تەندروستییەکانی دەرمانی ساختە:**

ڕەنگە دەرمانی ساختە چەند پێکهاتەیەکی ژەهراویی تێدا بێت، یان هیچ جۆرە پێکهاتەیەکی تێدا نەبێت، بەمەیش کاری خۆی ناکات و هیچ گۆڕانکارییەک لە چارەسەری نەخۆش دروست ناکات. چونکە دەرمانی ساختە دەبێتە هۆی شکستی چارەسەر، بەڵام زۆر جار پزیشکەکان ئەمە بە هۆکار دانانێن.

غەشکردن و ساختەکردنی دەرمان، کێشەیەکی کۆنە و لە کاتی ئێستاماندا لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەم و پیشەسازی و بازرگانیی نوێ ئەوەندی تر فراوان بوە. دەرمانی ساختە بوەتە هۆی پەیدابوونی چەندین نەخۆشیی یەکجار مەترسیدار لە ولاتانی

هەژار بە تایبەتی. دەرمانی ساختە، کێشەیەکی نێودەوڵەتییە و زۆرەبەی زۆری وڵاتانی جیهانی گرتوەتەوە.

**چۆن کۆمپانیاکانی دەرمان بە ملیۆنان دۆلاریان دەست دەکەوێت لە سەر ئەستۆی نەخۆشەکان:**

لە ڕووی زانستییەوە پێی دەگوترێت (داهێنان)، بەڵام لە واقیعدا بوەتە یەکێک لە کەرەستەکانی سەرمایەداریی بەکارهاتوو بۆ دادۆشینی هەژاران. ئەویش لە کەرتە هەرە هەستیار و گرینگەکەی بۆ ژیانی مرۆڤ، چونکە پیشەسازیی دەرمانیش وەک هەر پیشەسازییەکی تر دەچێتەی خانەی لۆژیکی دەستکەوت و کۆنترۆڵی ڕەهای کۆمپانیا کیشوەربڕەکان. ئەو کۆمپانیایانە هەوڵی فراوانکردن و زیاترکردنی داهاتەکانیان دەدەن بە هەر شێوازێک بێت، چ یاسایی بێت یان نایاسایی بێت. گوزارشتەکانی مرۆیی بە تەواوی لەو پیشەسازییەدا بوونیان نییە. کە لە بنەڕەتدا ئامانجی سەرەکیی دروستکردنی دەرمان، پاراستنی ژیانی مرۆڤە.

نرخەکانی دەرمان ئێستا یەکێکە لە گەورەترین بەربەست بۆ دەستەبەرکردنی چارەسەری پێویست. لە ماوەی ساڵی 2017دا زیاتر لە 83 ملیۆن کەس و زیاتر لە 40 وڵات پێویستیان بە یارمەتیی بە پەلەی تەندروستی و خۆراکی هەبوە. بە گوێرەی بانکی نێودەوڵەتییش، ڕەنگە لە ساڵی 2018 76 ملیۆن کەس پێویستیان بە یارمەتیی تەندروستی و خۆراکی هەبێت لە جیهان، بۆیە پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا ئەو مرۆڤانە دەتوانن دەرمان و چارەسەری پێویست دەستبەر بکەن بۆ خۆیان؟

**کۆمپانیاکان بە چ شێوەیەک پێویستیی خەڵک بۆ دەرمان دەقۆزنەوە؟**

دروستکەرانی دەرمانی ساختە لەو کارەیاندا ئەو دەرمانە بەرهەم دەهێنین کە بۆ نەخۆشییە بەربلاوەکان پێویستن و بە تایبەتیش پەتای مەلاریا. ئەو ژەهرە سەرتاسەری ناوچە هەرە هەژار و بێدەرەتانەکەی گرتوەتەوە. هەر بە گوێرەی ڕاپۆرتە پزیشکەکان، کە جەخت دەکەنەوە لە سەر ئەوەی: دەرمانی ساختە

نەک تەنیا دەبێتە هۆی مردنی ملیۆنان کەس، بەڵکوو بەشداریشە لە خولقاندنی دژیەک لە ناو جەستەی مرۆڤ و بۆ هەندێک چارەسەر و ڕێگرە لە وەرگرتنی.

دەکرێت بڵاوبوونەوەی دەرمانی ساختە بگەڕێنینەوە بۆ چاوچنۆکیی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دەرمان، چونکە گەر نرخەکان دادپەروەرانە بن و بگاتە دەستی زۆرترین کەس، بێگومان ئەو جۆرە ساختەکارییە سەر هەڵنادات. بە پێی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، لە هەر دە کەپسولێک کە لە وڵاتانی تازەدروستبوو دەفرۆشێت -بە شێوەیەکی تایبەتیش لە کیشوەری ئەفریقا- یەکێکیان ساختەیە، یان لە ئاستی پێویستدا نییە، ئەمەیش دەبێتە هۆی مردنی هەزاران کەس، لەوانەیش منداڵان کە زیاتر تووشی نەخۆشییەکانی هەوکردنی سی و مەلاریا دەبنەوە لەو کیشوەرەدا.

بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە دەرمانە ساختەیە، زیاتر پێوەندیی بە نرخەوە هەیە زیاتر لە هەموو شتێک. هەندێک لە دەرمانسازەکانی ئەفریقا لێدوانیان داوە بە ئاژانسی (ڕۆیتەرز)

و جەختیان لەوە کردوەتەوە، کە ئەوان ناچارن لە هەرزانترین وەبەرهێنەر دەرمان بکڕن، کە باشیش دەزانن پابەند نییە بە پێوەرەکان، بۆیە هەڕەشەیەکی زۆر لە سەر ژیانی خەڵک دروست بوە. چونکە دەرمانە ساختەکە ئەو هێندە پێویست و پێکهاتەی پێویستەی تێدا نییە، یان کارا نییە. زۆر جاریش دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی تر لای نەخۆشەکە.

بە گوێرەی لێکۆڵینەوەیەک کە تیمی زانکۆ ئەدنبرە ئەنجامی داوە، دەرکەوتوە نزیکەی 72 منداڵ بە هۆی هەوکردنی سییەوە مردوون ئەویش لە ئەنجامی ناکارایی دەرمانەکان. پێشتریش ڕێکخراوەکە ئاشکرای کرد کە (122 هەزار و 350 منداڵی ئەفریقی گیانیان لە دەست داوە ساڵی 2013 بە هۆی دەرمانی ساختە (مەلاریا). ئەفریقا لە هەر کیشوەرێکی تر زەرەمەندترە لە دەرمانی ساختە بە هۆی ئەوەی هەژارترینیانە.

وەک ئاشکرایشە هەر چەند ئاستی هەژاری زیاتر بێت، ئەوە هەلی دەستبەرکردنی چارەسەر و دەرمان کەمترە بە هۆی تێچوە زۆرەکەی و

نرخە خەیاڵییەکەی، کە کۆمپانیاکانی دەرمان دەیسەپێنن و بازاڕەکانی جیهانیان قۆرخ کردوە. ئەمە لە کاتێکدا ڕێـژەی فرۆشتنی دەرمـانـی ساختە لە ئەفریقا لە نێوان 70. 305 % یە و بەهای مامەڵەی بازرگانیکردنیش بە دەرمانی ساختە گەییشتوەتە 200 ملیار دۆلار. ئەو داهاتەیش تەنانەت داهاتی بازرگانیی مادەی هۆشبەریش تێپەڕ دەکات، کە لە نێوان 20 بۆ 40. لە ئەنجامیشدا نزیکەی 100 هەزار کەس ساڵانە بە هۆی دەرمانی ساختەوە دەمرن.

**دەستکەوتی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دەرمان لە جیهاندا:**

زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێین، کەرتی چاودێریی تەندروستی و دەرمان زۆر بەهێزانە پێشبڕکێ لەگەڵ بازرگانیی چـەک و بازرگانیکردن بە مرۆڤ و مادەی هۆشبەرەوە دەکات. ئەمەیش بە هۆی ئەو داهاتە زەبـەلاحـەی کۆمپانیاکان وەدەستی دەهێنن. ئەو کەرتە بە پڕ داهاترین کەرت هەژمار دەکرێت. بۆ نموونە کۆمپانیای (جونسۆن ئاند جونسۆن)ی ئەمەریکی ڕێژەی

داهاتەکەی گەڕاندوەتەوە بۆ دابەشبوونی سالانەیی بە درێژایی 50 سال بە هۆی بەرزکردنەوەی نرخی دەرمان بە شێوەیەکی بەردەوام.

**داهاتی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دەرمان:**

| ژ | گەورەترین کۆمپانیای جیهانیی دەرمان | داهات |
|---|---|---|
| 1. | فایزر ـ pfizer/ ئەمریکا | 22 ملیار دۆلار |
| 2. | نۆڤارتس / سویسرا | 9. 2 ملیار دۆلار |
| 3. | سانۆفی/ فەرەنسا | 4. 9 ملیار دۆلار |
| 4. | رۆش/ سویسرا | 12 ملیار دۆلار |
| 5. | میرک/ ویلایەتە یەکگرتوەکان | 4. 4 ملیار دۆلار |
| 6. | جلاکسو/ بەریتانیا | 8. 5 ملیار دۆلار |
| 7. | ئەسترازینکا/ بەریتانیا | 2. 6 ملیار دۆلار |

ئەو پێشکەوتنەی لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا بە دی هاتوون، وای کردوە ڕێگە و شێوازی پێشکەوتوتریش بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی مرۆڤ دابهێنرێن، چونکە لە فاکتەر و شێوازی تەقلیدییەکانی پزیشک

و دەرمانساز دەیگرنە بەر لە ئەنجامدانی کارەکەیان گوازراونەتەوە بۆ چارەسەرکردن بە شێوازی نوێ و ئامێری نوێ و تەکنیکی نوێ، کە یارمەتیدەر بوون لە بواری پزیشکیدا.

ئەمەیش وای کردوە پیشەسازیی دەرمانیش پەرەی پێ بدرێت، چونکە دەرمان کاریگەریی تەواوی لە سەر تەندروستیی هەر تاکێک لە کۆمەڵگەدا هەیە، بێگومان کاریگەریی سەلبییشی هەیە گەر بە شێوەیەکی ڕاستودروست نەگەیەنرایە نەخۆش، یان هەر بە هەڕەمەکی بە کار هێنرا و دروستکەرانی دەرمان پابەند نەبن بە ڕێسا یاساییەکانی کۆمپانیا و کەسەکان ناچار دەکات باشترین جۆر دەرمان بەرهەم بهێنن. دوا چار دەرمان تاکە چارەسەری نەخۆشییەکانە، بۆیە مرۆڤ ناچار بوە گرینگییەکی زۆر بە پیشەسازیی دەرمان بدات و پرۆسەی دروستکردن و هاوردەکردن و هەناردەکردنی و کارپێکردنیشی بە شێوەیەکی زانستییانە ڕێک بخات، تا تاک و کۆمەڵگە نەخاتە بەر مەترسیی لەناوچوون.

سەرچاوەی دەرمانی ساختە تا ئێستایش ناڕوونە و ناتوانرێت متمانە بە ناوەڕۆکەکەی

بکەیت. ئەمەیش دەبێتە هۆی شکستی چارەسەرەکە و دوا جاریش مردنی نەخۆشەکە، چونکە دەرمانی بەسەرچوو، یان ساختە لە هەموو شوێنێکی دونیادا هەیە و لە نێوان تێکەڵەیەک لە مادەی ژەهراوی و زیانبەخش و نێوان پێکهاتەیەکی ناکارایە. هەندێکیان ئەوەندە نزیک و هاوشێوەی دەرمانە ڕاستەقینەکەن تەنانەت کەسانی شارەزایش لە بواری دەرمانسازی لە خشتە دەبەن.

مافیاکانی غەشی دەرمان تەبەنای لاساییکردنەوەی دەرمان دەکەن و یاری بە ژیانی هاوڵاتییان دەکەن، بە تایبەتی هەژاران، کە توانای دەستبەرکردنی نرخی دەرمانی گرانیان نییە و بەئاسانی دەبنە نێچیری ئەو مافیایانە.

هیچ شتێک بۆ کەسی تاوانبار قورس نییە بیکات و هەموو پرۆژەیەکی تاوانکاری قابیلی جێبەجێکردنە. لەوەیش گرینگتر، هەمووی قابیلی دەستکەوتی زیاتری پارەی پیسە لەو جۆرە کردەوانە کە زۆر ئەستەمە پاک بکرێنەوە. پارەی پیس لە هەموو شوێنێک هەیە و هەموو شتێکیش بەرهەم دەهێنێت، لەوانەیش دەرمانی

ساختە. کە تاکە کاڵایە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری مرۆڤ نەک زیاترکردنی. پێویستە دەرمان درێژکەرەوەی ژیان بێت نەک کورتکەرەوە. ئومێدێک بێت نەک دروستکەری بێ ئومێدی.

قەبارەی بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختە لە سەرووی قەبارەی بازرگانیکردنە بە مادەی هۆشبەر! چونکە ئەنجامدەرانی تەنیا سزایەکی سوک وەردەگرن (ساڵێک زیندانی و غەرامەیەکی کەم بۆ تاوانبارانی دەرمانی ساختە، ئەمە لە کاتێکدا 40 ساڵ زیندانی بۆ بازرگانانی مادەی هۆشبەر بڕاوەتەوە. )

ئەوەی بوەتە جێگەی مەترسییش لەم ساڵانەی دوایی بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختەوە خواستێکی زۆری لە سەرە، لەبەر چەند هۆکارێک، گرینگترنیان: داهات و دەستکەوتی دارایی و پاشەکشەکردنی زۆرینەی وڵاتانی جیهان بە هۆی قەیرانی جیهانی. جگە لە گرینگینەدان بەو تاوانە لە لایەن دەسەڵاتدارانی زۆربەی وڵاتان. بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمەریکییش، کە لە ساڵی 2015 دەرچوە، قەبارەی فرۆشتنی دەرمانی ساختە ساڵانە دەگاتە 75 ملیار دۆلار. گەر بەراوردیشی

بکەین بە ساڵانی ئێستا، قەبارەکەی زۆر زیاتر بوە. (میرای بالسترازی) بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەنتەرپۆل، کە بەشداریی کۆنگرەی فەرەنسا کرد لە واشنتۆن لە بارەی ئەو تاوانە دەڵێت: (خواستێکی زۆر هەیە بۆ بازرگانیکردن بە دەرمانی ساختە لە کاتی ئێستادا، نیوەی زیاتری دەرمانە ساختەیش بە ڕێگەی ئەنتەرنێت دەفرۆشێت. وڵاتانی ئەفریقایش زۆرترین وڵاتی زەرەرمەندن لەو تاوانە، چونکە لە نێوان 30 بۆ40 لە سەدای دەرمانەکانی بۆ ئەفریقا ڕەوانە دەکرێن، یان هەر لەوێ دروست دەکرێن، دەرمانی ساختەن و هیچ جۆرە مادەیەکی چارەسەرکردنیان تێدا نییە. بە پێی داتاکان ساڵانە دەیان منداڵ لە وڵاتانی ئەفریقا دەمرن بە هۆی دەرمانی ساختەوە، کە تەنیا مادەیەکی نەوتی دەخنە ناو پیلەکانی.

ئەمانە ڕاستیی تۆقێنەرن، هەر چەندە ئاسان نییە مرۆڤ بتوانێت بگاتە داتایەکی ڕاستودروستی قوربانییان ئەو دەرمانە ترسناکانە بە هۆی چەند پرسێکی پەیوەست بە حکوومەتی ئەو وڵاتانە، کە تێیاندا چاودێریی تەندروستیی هیچ بەهایەکی نییە.

| | | |
|---|---|---|
| 1. | 600 ملیار دۆلار | قەبارەی دەرمانی ساختە لە جیهاندا |
| 2. | %1 | ڕێژەی دەرمانی ساختە لە وڵاتانی پێشکەوتوو |
| 3. | لە %30 | دەرمانی ساختە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دابەش دەکرێن |
| 4. | لە %49 | لە بازاڕەکانی تری جیهانی |
| 5. | %50 | ئەو دەرمانانەی بە ڕێگەی ئەنتەرنێت دەفرۆشرێن و دەرمانی ساختەن |
| 6. | لە %20 | وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سیستەمی ڕێکخستنی دەرمانی تێدایە |
| 7. | لە %50 | وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی کار دەکەن بە سیستەمی ئاست جیاجیا لە گەشەکردن و توانای کارپێکردن |
| 8. | %30 | وڵاتان هیچ ڕێکخستنێکی دەرمانییان نییە |
| 9. | 200 | حاڵەتی مردن بە هۆی دەرمانی مەلاریاوە لە ئەفریقا |

پزیشکی ململانێکان، ئەوە مانشێتێکی گەورەیە بۆ ئالینگارییەکی گەورەتر، چەقی مەیدانی گڕگرتوو بۆ چەمکی تەندروستیی کۆمەڵایەتی، کە بڕبڕەی پشتی دانانی (ستراتیژیەتی تەندروستییە) باس لە پرسی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ژینگەییەکان دەکات. ئەو چەمکەیش تەنیا لە سەر چەمکی ململانێی جەنگی و کردەوەی

توندوتیژ کورت نابێتەوە، بەڵکوو لە سەر سیستەمە لاواز و ململانێ سیاسییەکانیش.

بە پێی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییش بۆ ساڵی 2016 ئەو دەرمانانە بەو جۆرە پۆلێن دەکرێن:

- کەمیی مادەی کارا.
- مادەی پیسبوو.
- بە ناو شێوە ساختەیە.
- پێکهاتەیەکی وەهمییە
- مادەی چارەسەر لە ناویدا سفرە.
- پێکهاتەیەکی دەرمانیی هەڵە.
- پێکهاتەی دەرمانیی ڕاست بەڵام بە پێوەری هەڵە.

زۆربەی جاریش ئەو دەرمانانە لە ناوچەکانی هەژارنشین و لە ژینگەیەکی نا تەندروست و پیسبوو بە بەکتریا دروست دەکرێن. ناوچەی پڕ لە پشێویی کۆمەلایەتی و سیستەمی تەندروستیی لاواز و جێبەجێنەکردنی یاسا و لێپێچینەوە.

## نموونەی قاچاخیی دەرمان لە وڵاتانی عەرەبیدا

پاڵنەر و زەمینەی بەرفراوانبوونی قاچاخچێتیی دەرمان لە وڵاتانی عەرەبیدا

دیاردەی قاچاخچێتی لە بواری دەرماندا وڵاتانی عەرەبییشی وەک زۆرێک لە وڵاتانی جیهان گرتووەتەوە، لێرەدا تایبەتمەندیی قاچاخچێتیی دەرمان خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیەتی کە جودای دەکاتەوە لەو شێوازەی کە لە ئەورووپا و ئەمەریکای لاتیندا هەیە. هەر بۆیە زیادبوونی کاری قاچاخچێتیی دەرمان لەم چەند ساڵەی دواییدا و بە تایبەتی لە دوای

بەهاری عەرەبییەوە بوەتە مایەی سەرنجی کۆڵەران و توێژەرانی پەیوەست بەو بوارە. بۆ ئەم مەبەستەیش گەلێ لە وڵاتانی وەک یەمەن، لیبیا، سعوودیە، میسر، عێراق و سووریا خاڵی زەقی ئەو گۆڕانکارییانەن کە بوونەتە دیاردەی کاری مەترسیداریی قاچاخچێتی لەو وڵاتانەدا، بە تایبەتی لەو وڵاتانەی کە جەنگی ناوخۆ و ناجێگیریی سیاسی و گەندەڵی و ململانێ و جەنگی ناوخۆ تەنگی پێ هەڵچنیون.

دیاردەی قاچاخچێتیی دەرمان لە بازاڕی ڕەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دیاردەیەکی مەترسیدارە و لە کاتێکی دوورمەودادا کاریگەرییەکی نەرێنی لە سەر تەندروستیی مرۆڤی ئەو کیشوەر و وڵاتانە دەبێت. لەوێدا بێکاری و هەژاری و دیاردەی ناجێگیریی سیاسی فاکتەرێکی کاریگەرە لە سەر ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتییان و هەر بۆیە هەموو زەمینەکانی چالاکبوونی باندە تاوانکارەکان لەو سنورانەدا ڕەخساون. لێرەدا نموونەی چەند وڵاتێک وەردەگرین کە بە شێوەیەکی خێرا لەم چەند ساڵەی دواییدا دیاردەی قاچاخچێتیی دەرمان لە نێویاندا بڵاو بوەتەوە.

**یەمەن**

یەمەن یەکێکە لەو وڵاتانەی کە بە شێوەیەکی بەرچاو دیاردەی دەرمانی ساختە و قاچاخ تێیدا بڵاو بوەتەوە. لاوازیی یاسا و نەبوونی لێپێچینەوەیەک دەرهەق بەو ڕێسایانەی کە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی هۆشیاریی لە بارەوە دەدا هۆیەکی کاریگەرە کە ئەو وڵاتەی کردوەتە زەمینەیەکی لە بار بۆ زەقبوونەوەی دیاردەی قاچاخچێتیی دەرمان. لەم میانەدا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و ئەو دەزگایانەی کە پێوەندیدارن بە ڕەوشی تەندروستییەوە زۆر بە ترسناکی هۆشداری لە بارەی ڕەوشی یەمەنەوە دەدەن.

ڕاپۆرتە فەرمییەکانی حکوومەتی یەمەنی و زانیارییە بڵاوکراوەکانی نێو وەزارەتی تەندروستیی ئەوە دەخەنە ڕوو کە ڕێژەی 60%ی ئەو دەرمانانەی لە بازاڕەکانی یەمەندا دەخرێنە ڕوو بریتین لە دەرمانی ساختە و قاچاخ و دەرمانی پزیشکیی بازرگانی. یەمەن ئەو دەرمانانەی کە لە دەرەوە دەیهێنێت زیاتر لە 50 وڵاتی عەرەبی و جیهانیی جیاوازەوە هێناونی و بە بڕی بەهای 117 ملیۆن دۆلار

سالآنه دەرمانی پزیشکی هاوردە دەکات. هاوکات لە ناوخۆی یەمەندا 7 کۆمپانیای بەرهەمهێنانی دەرمان هەن کە تێچووی هەر یەکەیان ملیۆن تا نیوملیۆن دۆلار دەبێت. بەرهەمی ئەو کارگانە لە ئاستی دابینکردنی پێداویستییە ناوخۆییەکاندا نییە. بە سودوەرگرتن لە سەرچاوە فەرمییەکان لە یەمەندا بە سەدان جۆری جیاوازی دەرمان لە ولآتانی عەرەبی و بیانییەوە هاوردە دەکرێت. لە دوایین ڕاپۆرتی دامەزراوەی بالآی داوودەرمان لە یەمەندا ئەوە خراوەتە ڕوو کە 176 جۆر لە دەرمان بە شێوەیەکی قاچاخ لە دەرەوە دەهێنرێتە ناو یەمەنەوە. لەوانە 46 جۆریان کۆپیکراو و ساختەیە و بە شێوەی شاراوە و یاساغ تێکەڵ بە بازاڕەکان ن و دەرمانخانەکان دەکرێت. بە گوێرەی سەرچاوە ناحکومییەکان زیاد لە 290 جۆر لە دەرمان هاوردە دەکرێت و تێکڕای ئەو دەرمانانەیش بە شێوەی قاچاخ دەهێنرێن و زیاتر کۆمپانیا و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتان وان لە پشتییەوە. بۆ نموونە دەوڵەتی سعوودیە لە نێو تەواوی ئەو دەوڵەتانەی کە دەرمانی یاساغ

دەنێرن بۆ یەمەن یەکەمینەن چونکە تەنها لە سعوودیەوە 76 جۆر دەرمانی ساختە و یاساغ بە شێوەی نافەرمی و بە قاچاخی دێنە ناو یەمەنەوە. لە دوای سعوودیەیش میسر دێت، کە لە میسرەوە 67 جۆر دەرمـان بە شێوەی قاچاخ دێتە ناو یەمەنەوە. بە گوێرەی زانیاریی نـاو دەرمانخانەکانی یـەمـەن زۆرتـریـنـی ئەو دەرمانانەی کە ساختە و کۆپیکراون و لە ناو دەرمانخانەکانی یەمەندا هەن لە وڵاتانی چین و هیندستانەوە دێـن. بـە گـوێرەی زانیارییە پزیشکییەکان لە یەمەندا 4000 دەرمانخانە هەن کە 1350 دەرمانخانەیان فەرمین لە ژێر چاودێریی دامەزراوە پزیشکییە فەرمییەکاندان.

خاڵی مەترسیدار لە یەمەندا بریتییە لەوەی کە بە پێچەوانەی زۆرێک لەو وڵاتانەی کە کاری قاچاخچێتیی تێدایە، لێرە خـودی دامــەزراوە حکومییەکان بەشێکن لـەبـرەودان بـە کـاری قاچاخی. بە گوێرەی وتەی سـەرۆکی سـەندیکای پزیشکانی یەمەن، لە یەمەنەدا ناتوانرێت ڕێ لەم دیاردەیە بگیررێت، چونکە خودی دەسەڵات بەشێکە لە زەمینەسازی بۆ کاری قاچاخ و بۆ

خۆیان تێوە گلاون لە قاچاخچێتیی دەرماندا. سەرۆکی سەندیکا لێدوانەکانی لە سەر ڕژێمی پێشووی یەمەنە و بە گوێرەی زانیارییەکانی ئەو دەسەڵات تەواوی ئاسانکاریی دەکات بۆ کۆمپانیا قاچاخچییەکانی دەرمان. دکتۆر موحەمەد حاج پسپۆڕی کاروباری پزیشکی کە بەڕێوەبەری دامەزراوەیەکی پزیشکییە دەڵێ: بە هۆی دەرمانی ساختەوە ژیانی بەشێک لەوانەی کە نەخۆشیی درێژخایەنیان هەیە یان گرفتاری شێرپەنجە و نەخۆشییە کتوپڕەکانی وەک جەڵدەی دڵ و مێشکن، کەوتوەتە مەترسییەوە. هەروەها دکتۆر ناجی مەسعەد کە دەرمانسازێکی دیاری یەمەنییە پێی وایە، زۆرترینی ئەو دەرمانانەی دێنە ناو یەمەنەوە دەرمانی بەسەرچوون و بە شێوەی ساختە مێژووی دەرچوون و بەسەرچوونیان لێ دراوە. خاڵێکی تر کە زیاتر جێگەی مەترسییە ئەویش ئەوەیە، ئەو دەرمانانەی کە پێناسە کراون و خاوەنی کوالیتی و بەهای بەرزن، تێکڕا دەرمانی کۆپیکراون و بە شێوازی وەها کاریان تێدا کراوە کە دەرمانی دروست و نادروستیان لێک جودا ناکرێتەوە. هاوکات خاڵێکی تر کە

جێگەی ئاماژەپێدانە ئەوەیە ئەو دەرمانانەی کە دەهێنرێنە یەمەنەوە بە شێوازێک دەهێنرێن کە هەڵگرتن و شاردنەوە و ڕێگەی هاتنیان بە جۆرێکە کە زیان بە دەرمانەکە دەگەیەنێت و بە پێچەوانەوە لە دەرمانەوە دەبنە مادەیەکی کوشندە و ژەهراوی و چەندین دۆسیەی لەو جۆرە لە نێو یەمەندا تۆمار کراون کە بە هۆی خراپهەڵگرتن و نەمانەوەی لە ڕێکاری سەلامەتدا تێک چوون و بوونەتە مایەی دەرهاویشتەیەکی مەترسیدار بۆ سەر ژیانی هاوڵاتییانی یەمەنی.

دکتۆر سامی دەبعی لە ناوەندێکی یەمەنی بۆ توێژینەوە ژینگەییەکان دەڵێت: زۆرێک لەو دەرمانە ئەسڵانەی کە دەهێنرێن، لە کاتێکدا دەرمانی ناوازە و کوالێتیی بەرزن، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە بە شێوەی قاچاخ دەهێنرێن و ڕەچاوی ژینگەی گواستنەوەیان ناکرێت، دەبنە دەرمانی ژەهراوی و زیانی گەورە بە تەندروستیی هاوڵاتییە بیمار و نەخۆشەکان دەگەیەنن.

چاودێران لەم سۆنگەیەوە پێیان وایە هۆکاری گەشەی کاری قاچاخچێتیی دەرمان لە

یەمەندا دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی دامەزراوەیەکی چاودێریی توندوتۆڵ و لێپێچینەوە لە لادەر و سەرپێچیکارانن، هەروەها ڕێسا و یاساکانیش لە هەمبەر ئەو پرسەدا لە ئاستی پێویست نین، هەم لاوازن هەمیش توانای جێبەجێکردنیان لاوازە. ئەمە وای کردوە کە ئەو دەرمانخانانەی کە پەیجوری قازانجی فرەن لە ڕەوشی ناهەمواری ئابووریی یەمەندا پەنا ببەنە بەر دەرمانە یاساغ و قاچاخەکان، هەر بۆیە لە ئێستادا یەمەن لە پێشەنگی ئەو وڵاتانەدایە کە هاوردەی دەرمانی قاچاخ دەکات و وەک وڵاتێکی هەژار بوەتە جێ سەرنجی دامەزراوە تەندروستییە جیهانییەکان. ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی پێی وایە، لە بازارەکانی جیهاندا بڕی 200 ملیۆن دۆلار دەرمانی قاچاخ هەیە و زۆرترینی لە نێو بازاڕی وڵاتانی هەژار و کەمدەرامەتدایە کە یەمەن یەکێکە لەو وڵاتانە. بە جۆرێک لە هەندێک لە ساڵەکاندا 70% یان 50%ی بڕی ئەو دەرمانەی لە بازاڕەکاندایە بریتییە لەو دەرمانانەی کە بە قاچاخی هێنراوە و دەرمانی ساختە و کۆپیکراون.

ولاتانی عەرەبی لە پێشەنگی ئەو ولاتانەن کە دەرمانی ساختە و هاوردەکراویان تێدایە. بە شێوەیەک ئەوە خەملێنراوە کە بەرهەمی خۆرهەلاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا تێکڕای 7%ی بەرهەمی ئەو دەرمانەیە کە لە بازاڕەکاندایە و ئیتر بڕی گەورەی کە دەمێنێتەوە بریتییە لەو دەرمانە ساختانەی کە لە چین و هیندستانەوە هاوردە دەکرێن.

راوێژکاری یەمەنی بۆ بەرهەمی دەرمان عەبدولڕەحمان عەلەفی پێی وایە کە ئەو دەرمانانەی کە بە قاچاخ دەهێنرێن ترسناکترین هۆکاری تێکچوونی شیرازەی تەندروستیی هاولاتییانی یەمەنن. ئەو دەلێت، ئەوەی تێبینیمان کردوە کە دیاردەی قاچاخچێتیی دەرمان زۆرێک لە ولاتان پێوەی دەنالێنن بەلام هیچ کام لەوانە هێندەی یەمەن گیرۆدە نەبوون. بە گوێرەی وتەی عەلەفی جۆرەکانی قاچاخچێتیی دەرمان لە یەمەندا بەم شێوەیەن:

قاچاخچێتیی دەرمانی ساختە و کۆپیکراو و ماوەبەسەرچوو. دوەم جۆری قاچاخچێتیی بریتییە لە قاچاخچێتیی دەرمانی دروست و

کوالیتیی بەرز، بەڵام دوور لە چاوی حکوومەت و بە شێوەی نافەرمی و بە شێوەیەک کە هەڵگرتن و پاراستنیان تەندروست نییە و دوا جار دەبنە هۆی تێکچوونی سودی دەرمانەکە و دەبنە مایەی زیان بۆ سەر تەندروستیی هاولاتییان، ئەم دەرمانانەی کە دەهێنرێن هیچ کامیان لە ژێر چاودێریی حکوومەت و دامەزراوە تەندروستییەکان و بریکارە فەرمییەکانی دەرمانی ئەو ولاتەدا نیین.

لەم بارەیەوە دکتۆر موحەمەد ئەحمەد شقاقی لە کۆلێژی دەرمانسازیی عەدەن دەڵێت: تێکڕای ئەو دەرمانانەی کە بە شێوەی قاچاخ دەهێنرێتە ناو یەمەنەوە 60%ی کۆی ئەو دەرمانانە پێک دەهێنن کە لە دەرمانخانەکانی یەمەندا هەن. هەروەها دامەزراوەی باڵای دەرمان لە یەمەن ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە 176 جۆری دەرمان لە یەمەندا هاوردە دەکرێت. شوقاقی پێی وایە یەمەن بوەتە زبڵدانی دەرهاویشتە خراپەکانی ولاتانی زەنگین و خراپترین دەرهاویشتەیش خۆی لە دەرمانی قەڵب و تەزویردا دەبینێتەوە کە بە لێشاو دەیهێننە بازاڕەکانی یەمەنەوە.

له ئێستادا نزیکەی 10 هەزار کۆمپانیای گەورەی دەرمان لە جیهاندا هەن، بەڵام 90%ی بازرگانیی دەرمانی جیهان لە لایەن 10 کۆمپانیای گەورەوە دەستیان بە سەردا گیراوە. هەروەها 25 کۆمپانیای نێونەتەوەیی دەستی گرتوە بە سەر 60 % کڕینی دەرمان. هەروەها 45 وڵات هەن کە لە جیهانی سێهەمدان پشت بەستوون بە هاوردەی دەرمان. لە تێکڕای وڵاتانی جیهانی سێدا تەنها 10%ی کۆی بەرهەمی دەرمانی جیهانی لە لایەن ئەوانەوەیە. بە گوێرەی سەرچاوە فەرمییەکانی یەمەن، تەنها دەتوانن 10%ی کۆی ئەو دەرمانانە بۆ ناوخۆ دابین بکەن کە پێویستیانە، کۆی ئەوانی تر دەبێت لە دەرەوە بهێنرێن.

لێرەدا ئەوەی ئاتاجی یەمەنییەکانی زیاد کردوە بۆ دەرمانی قاچاخ بریتییە لە بەهای بەرزی ئەو چارەسەرییانەی کە نەخۆشیی درێژخایەن و ترسناکی وەک شێرپەنجەن، ناچار لەو کۆمەڵگە هەژارنشینەدا کە زیاد لە نیوەی دانیشتوانی لە ژێر هێڵی هەژارییەوەن، پەنا دەبەنە بەر دەرمانی ساختە و هەرزان،

ئەوانەی لە ژێر چاودێریی تەندروستی نین و بە قاچاخی هێنراون. هەروەها خاڵێکی تر بریتییە لەوەی کە زۆرێک لەو دەرمانانەی کە دەهێنرێنە نـاو یـەمـەنـەوە بـە تـایبـەتـی ئـەوانـەی کـە بە قاچاخی دەهێنرێن، دەرمانێک نیین کە پێویستی هەنووکەیی بن. زیاتر دەرمانی لەشجوانی و تایبەتن بە لاوازیی سێکسییەوە. ئەو دەرمانانە بـە گـوێرەی سـەرچـاوە فەرمییەکانی یەمەن نزیکەی 42%ی کۆی دەرمانی هاوردەی قاچاخ لە یەمەندا پێک دەهێنن. بۆ نموونە لە یەمەندا لە 2013 دا بڕی 430 ملیۆن دۆلار دەرمان هاوردە کراوە، کە تەنها 10%ی ئەو دەرمانانە پێداویستییە پزیشکییەکان بـوون. ئەوانی تر دەرمانی ناپێویست و جوانکاری و تەرفیهی بوونە. هەروەها زۆرێک لەو دەرمانانەی کە لە ئاستی جیهاندا قەدەغە و یاساغن و دەبێت لە ژێـر چاودێریی وردا بە کـار بهێنرێن، بە تایبەتی دەرمـانـە وزەبـەخـشـەکـان، کەچی لە یەمەندا بە ئاشکرا بە کار دەهێنرێن و زۆرترین ڕەواجیشیان هەیە، بێ ئاگا لەوەی کە چەندە زیانی تەندروستی و چەندە لاوی ئەو وڵاتە

گرفتاری ئەو جۆرە دەرمانە بێسود و یاساغانە بوون. وڵاتی یەمەن لە پێشەنگی ئەو وڵاتانەدایە کە ڕادەی گەندەڵی تێیدا فرە باڵایە، بە تایبەتی ئەو ڕووداوانەی کە لە ساڵی ڕابردوودا ڕوویان دا و ململانێ سیاسییەکان و جەنگە ناوخۆییەکەی درێژە پێ دا بە تەواوی زەمینەی خۆش کرد تا بازرگانەکان و باندەکان و کۆمپانیا گەورە قاچاخچییەکانی جیهان سەرنج بدەنە سەر یەمەن و لەوێدا کار و کاسبیی خۆیان برەو پێ بدەن.

یەکێک لەو خاڵە ترسناکانەی کە بوەتە سەرنجی میدیاکانی جیهان و توێژینەوەکان لەم چەند ساڵەی دواییدا سەرنجیان خستە سەر، ئەویش تێکەڵبوونی کار و بەرژەوەندیی هاوبەش و قازانجی گروپە تیرۆریستییەکان بوو لەگەڵ دەرمانی قاچاخدا. بۆ ئەم مەبەستەیش چەند وڵاتێک بە هەند وەرگیروان، کە گرینگترینیان دەکەونە سۆماڵ و یەمەن و لیبیا و میسر و جەزائیر و سووریا و عێراقەوە. بە گوێرەی زانیارییەکان ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان چ ئەوانەی سەر بە قاعیدەن

و له نیمچه دوورگەی عەرەبی ڕۆڵیان هەیە، چ ئەوانەی گرووپی توندڕەون، وەک بزوتنەوەی شەبابی سۆماڵی یان گرووپەکانی سەر بە داعش لە میسر و لیبیا و سووریا و عێراقدا. هەموو ئەوانە بە جۆرێک لە جۆرەکان و بە گوێرەی زانیارییە پەرشوبڵاوەکان دەستیان تێکەڵ کردوە لەگەڵ قاچاخچێتیی دەرماندا. بۆ نموونە لە لیستی ئەو سەرچاوانەی کە داهاتی گرووپە تیرۆریستییەکان دابین دەکەن، قاچاخچێتیی دەرمان لە پلەی چوارەمدا هێنراوە. بۆ نموونە تێکرا ئەوانە سەرقاڵی قاچاخچێتیی نەوت، قاچاخچێتیی شوێنەوارە و پارچە شوێنەوارییەکان، قاچاخچێتیی زێڕ و مرۆڤ (کچ و ژن) قاچاخچێتیی مادەی هۆشبەر و دەرمانن. لەبەر ئەوە بەشێک لەو دەرمانە قاچاخەی کە لە وڵاتانی عەرەبیدا ئاسانکارییان بۆ دەکرێت سەرچاوەی داهات و قازانجەکەی تەنها بۆ مافیا و گرووپە نێونەتەوەییەکان نییە، بەڵکوو لەم ساڵانەی دواییدا گرووپە تیرۆریستە ئیسلامییەکانیش تێکەڵ بەم شێوازی بازرگانی و قاچاخچێتییە بوون.

**ليبيا**

ليبيا يەكێكە لەو وڵاتەی کە هاوشێوەی یەمەن گرفتاری دەرمانی ساختە و دەرمانی قاچاخ و نەبوونی دەرمانی فەرمی و تەندروستە. بە هۆی نەبوونی دەرمان و پشێوییەکانی ئەم چەند ساڵەوە، لیبیا لە دوای بەهاری عەرەبی و نەمانی دەسەڵاتی ڕژێمی موعەمەر قەزافی بوەتە زۆنگاوی ساغکردنەوەی بەرهەمی دەرمانی ساختە و کۆپیکراو.

ساڵانە 1. 5 ملیار دیناری لیبی، دەرمان هاوردە دەکرێت کە دەکاتە دوو ملیار دۆلار، ئەمەیش بە گوێرەی تێکڕای دانیشتوانی لیبیا کە دەکاتە 7 ملیۆن دانیشتوان ڕێژەیەکی ئێجگار زۆرە. بە گوێرەی سەرچاوەکان تێکڕای دەرمانی هاوردە بۆ لیبیا 70%ی بریتییە لەو دەرمانانەی کە بە قاچاخ دەهێنرێن، زۆرترینی ئەو دەرمانانەیش لە مەغریب و تونس و خۆرهەڵاتی وڵاتەوە هاوردە دەکرێن. لەگەڵ ئەوەیشدا لیبیا وەک ناوەندێک یان وەک پردێک تەماشا دەکرێت بۆ گواستنەوەی دەرمانی قاچاخ بۆ وڵاتانی تری دراوسێ بە تایبەتی بۆ وڵاتی چاد. دەرمانی هاوردە لە لیبیادا لە ئێستادا لە

سنورەکانی میسرەوە دەهێنرێن، لەوێوە دێنە ناوچەی (امساعد) لەوێدا هەڵدەگیرێن و هیچ مەرجێکی هەڵگرتنی تەندروستییان تێدا نییە و پاشان دەگوێزرێنەوە بۆ دەرمانخانەکان، کە هیچ کام لەوانە گوێ بە ڕێسا و یاساکان نادات و تەنهاوتەنها بیر لە قازانج و بەرژەوەندیی مادی دەکرێتەوە. لە ئێستادا برەوێکی گەورەی دەرمانی قاچاخ لە لیبیادا هەیە. میسر لیبیای کردوەتە گۆڕەپانی ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی. لە میسردا کۆگای دەرمان و دامەزراوەی دەرمان و سەنتەری گەورەی دەرمانسازی هەن. زۆرترینی ئەو سەنتەرانە فەرمین، بەڵام بە بێ گوێدانە هەناردەی فەرمی و بەشاراوەیی لیبیایان کردوەتە دەروازەی بیابان و لەوێوە لینکی فراوانیان لەگەڵ 14 وڵاتی ئەفریقیدا چێ کردوە، بە تایبەتی وڵاتی چاد. بازرگانە میسرییەکان کە هەندێکیشیان نزیکن لە دەسەڵاتەوە، ڕەوشی نالەباری لیبیا بە دەرفەت دەزانن بۆ دەستخستنی قازانج و دەستکەوتی مادی. بە گوێرەی زانیارییەکان لە میسردا زۆرترینی ئەوانەی کە سەرمایەداری

پله بەرزن، بە هۆی قاچاخچێتیی دەرمانەوە لەگەڵ لیبیا گەییشتوونەتە ئەو ئاستە. لیبیا لە دوای 2011ـەوە هیچ هەنگاوێکی بۆ ڕێگری لەو شەپۆلەی دەرمانی قاچاخ نەگرتوەتە بەر. پێشووتر بە گوێرەی یاسای 1969 و دواتریش یاساکان لە 1972 و پاشانیش لە 2006 دا هەموار کران، ڕێوشوێنی توند لە سەر پرسی دەرمان و دەرمانی قاچاخ هەبوو، بەڵام لە دوای بەهاری عەرەبییەوە لیبیا بوەتە مەیدانی بازرگانی و تێوەگلانی کۆمپانیاکانی دەرمان بە قازانجێکی خەیاڵییەوە. دیارە ئەمەیش دەرهاویشتەی دژواری لە سەر ئاییندەی سەلامەتیی هاوڵاتییانی لیبیا بە جێ هێشتوە. چونکە لە لیبیادا ڕێژەی نەخۆشییە درێژخایەنەکان لە تەمەنی لاویدا ئێجگار زۆر بوون. بە گوێرەی توێژینەوەیەکی ناوەندی پزیشکیی بنغازی، ئەوە خراوەتە ڕوو کە مادە وزەبەخشەکان کە بە شێوەی قاچاخ لە میسرەوە دێنە لیبیا، بە جۆرێک بوەتە دیاردە کە وەک ئاو لە کۆگاکانی ناو بازاڕدا فرۆشیان هەیە و لاوان پێوەی گرفتار و ئالوودە بوون، ئەمەیش هۆیەکە کە هەر بە لاوی گرفتاری

نەخۆشییە درێژخایەنەکانی وەک و فشاری خوێن و شەکرە و نەخۆشییەکانی جگەر ببن.

بە گوێرەی سەرچاوەکان، دەسەڵاتدارانی لیبیا بە جۆرێک لە جۆرەکان هەماهەنگیی کۆمپانیا دیارەکانی دەرمان دەکەن. ئەو کۆمپانیایانە کە کۆمپانیای فەرمیی ساغکردنەوەی دەرمانن. بۆ نموونە کۆمپانیای ئیبن سینا، یەکێکە لە کۆمپانیا بەهێز و کاریگەرەکان لە لیبیا، بەڵام لقەکانی لە ناوچە سنورییەکانی بیابان بە هاوکاریی دەسەڵاتدارانی میریی دووچاری کاری قاچاخ و بازرگانیی دەرمان بوون، لەم میانەیشدا میری کەمتەرخەمە لە لێپێچینەوە. هەروەها لە ئێستادا لە لیبیادا چەندین گروپی چەکداریی توندڕەو بوونیان هەیە، گرینگترینیان لقی داعشی لیبییە، ئەوانە یەکێک لە سەرچاوەکانی داهاتیان بریتییە لە قاچاخچێتیی دەرمان لەگەڵ نەوتدا، بەم شێوەیە توانیویانە پایەکانی مانەوەی خۆیان ڕابگرن و چەکوچۆڵ و داهاتی مادی دەست بخەن.

بە گشتی سەرنجی دەرمانی قاچاخ و ساختە لە جیهانی عەرەبیدا وابەستەیە بە

چەندین پاڵنەرەوە کە بەردەوام برەو بەم ڕێوشوێنە ترسناکەی بواری دەرمان دەدات، ئەو ڕێوشوێنەی کە لە وڵاتانی عەرەبیدا هەیە هاوشێوەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتینە، بەڵام بە شێوەیەکی ترسناکتر و بە تایبەتمەندیی جیاوازتر.

لە وڵاتانی عەرەبیدا زەمینە بۆ زۆرێک لە کاری بازرگانیی نایاسایی و قاچاخچێتی ڕەخساوە، لەو میانەدا زۆرێک لەو وڵاتانەی کە بەردەوام شەڕ و ئاژاوە و ناجێگیریی سیاسیی تێیاندا باڵادەستە و بوونەتە کەشێکی زۆر لە بار بۆ زیندووڕاگرتنی ئەو قاچاخچێتییەی کە ئەمڕۆ ڕێکخراوە تاوانکارەکان لە وڵاتانی تردا پێوەی سەرقاڵن. لە ئێستا دا وڵاتانی عەرەبی زەمینەیەکی لە بارن بۆ قاچاخچێتیی پارچە شوێنەوارییەکان، زێڕ، نەوت، دەرمانی هۆشبەر و دەرمانی پزیشکی. هەموو ئەوانە برەودان پێیان وابەستەیە بەم خاڵانەی خوارەوە:

1. ناجێگیریی ڕەوشی سیاسی و جەنگە ناوخۆییەکان، بۆ نموونە لە یەمەن، عێراق، سودان، لیبیا، سووریا، بەحرەین...هتد.

ناجێگیریی سیاسیی توانیویەتی گورزێکی کوشندە بداتە ئەو ڕێسا و یاسایانەی کە لە بەرانبەر کۆنترۆڵکردنی دەرماندا بوونیان هەیە.

2. سەرهەڵدانی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان.
بە تایبەتی لە دوای بەهاری عەرەبییەوە بیری جیهادی و کاری توندوتیژی بە کاریگەریی ئەو سەرەتایەی کە قاعیدە دەستی پێ کرد لە دوای گرتنی عێراق لە لایەن هاوپەیمانان و دواتریش هەنگاوی دوەم لە دوای بەهاری عەرەبی و دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام، ئەم ڕێکخراوانە هاوشێوەی هەمان ئەدەبیات و ئەتەکێتی بزووتنەوەی تاڵیبان لە ئەڤغانستان کە دەستی برد بۆ قاچاخچێتی و بەرهەمی مادەی هۆشبەر، ئەمانیش بە قاچاخچێتیی دەرمان و دەستتێکەڵکردن لەگەڵ ڕێکخراوە تاوانکارە نێونەتەوەییەکان ئەوە ساغ بوەتەوە کە لە چەند وڵاتێکدا ئەم جووڵانەوانەی دەستیان داوەتە قاچاخچێتیی دەرمان و لەم ڕێگەیەوە قازانجێکی خەیاڵییان بە دەست کەتوە.

3. لاوازیـی یاسا و ڕێساکان و نەبوونی سیستەمێکی تۆکمە لـە زۆرێـک لـە وڵاتـانـی عەرەبیدا. کەموکورتی لە یاساکان، هۆکارێکە تا لێپێچینەوە و سەپاندنی ڕێوشوێنی توندی یاسایی نەگیرێتە بەر و هاندانێک بێت تا گرەوی زیاتر لە سـەر قاچاخچێتیی دەرمـان بکرێت. ئـەم ڕەوشــە لـە زۆرێـک لە وڵاتـانـی عەرەبی زەمینەسازیی تەواوی بۆ کراوە.

4. لاوازیی بنەما ئابوورییەکان و هەبوونی بێکاری و هەژاری و نەبوونی دەرفەتی کار وا دەکات، کە لاوان بچنە نێو تۆڕەکانی کاری یاساغ و قاچاخچێتییەوە، ئەمەیش لە زۆرێک لە وڵاتانی عەرەبیدا بە تایبەتی میسر، ئێجگار جێگەی سەرنجە، چونکە بە گوێرەی زانیارییەکانی پەیوەست بە قاچاخچێتیی دەرمـان و مادەی هۆشبەر تەنها لە میسردا نزیکەی 10 هەزار لاو لە یەک هێڵی سنوری لەگەڵ لالیبیادا بە ناوی ناوچەی (اساعد) سەرقاڵی کاری قاچاخچێتیی دەرمانن و ئەم لاوانە لە لایەن تۆڕێک ڕێکخراو و گروپی نهێنییەوە سەرپەرشتی دەکرێن و بەشێکیشیان بۆ خۆیان کارمەندی میرین و سەر بە دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەتن.

5. قاچاخچێتیی بواری دەرمان هۆیەکە بۆ قازانجێکی زۆر و لە چاو جۆری قاچاخچێتیی تردا یاساکان لە تێکڕای وڵاتانی عەرەبی فرە توند نین، ئەمەیش وای کردوە کە پەنابردن بۆ قاچاخچێتیی شوێنەواری و مادەی هۆشبەر زیاتر خۆیان ببوێرن لێی و ڕوو بکەنە ئەو کارە یاساغەی کە یاسا کەمتر لە بارەیەوە دەپێچێتەوە.

6. گەندەڵی و ڕەوشی نالەباری وڵات. لە گەندەڵیدا دیاردەیەک لە زۆرێک لە وڵاتانی عەرەبی و ناوچەکەدا زەق بوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە خودی دەسەڵاتداران دەست تێکەڵ دەکەن لەگەڵ ئەو کارانەی کە یاساغن بە یاساکانی وڵات، بۆ نموونە لە لیبیا و یەمەن و سووریا و عێراقدا خودی دەسەڵاتداران و لایەنە پێوەندیدارەکان هەڵدەستن بە کاری قاچاخچێتیی دەرمان.

7. هەماهەنگیی وڵاتان بۆ کاری قاچاخ. ئەم هەماهەنگییە دوو دیوی هەیە، دیوێکی وابەستەیە بە نیازی هەر دەوڵەتێک بۆ خراپبوونی ڕەوشی تەندروستیی ئەو وڵاتە دراوسێیەی کە نەیارێتی، بۆ ئەم مەبەستەیش لە پێناو قازانجی مادیی

خۆیدا، سنور والآ دەکات تا دەرمانی ساختە و بەسەرچوو ببریتە نێو ولآتێکی ترەوە کە نەیاریتی. ئەم ڕەوشەیش بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێـژراو دەسەلآتدارانی سعوودیە دژ بە ولآتی یەمەن کاری لە سەر دەکەن. بۆ نموونە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا یەمەن بەردەوام سەرکۆنەی دەسەلآتدارانی سعوودیەیان کردوە کە لەوێوە دەرمانی ساختەی هیندی و چینی دەهێنرێتە ولآتەکەیان، هەموو ئەو دەرمانانەی کە لە لایەن سعوودیەوە دەنێررێت بۆ یەمەن، بە هیچ جۆرێک لە ناو سعوودیەدا ساغ نابنەوە. بە گوێرەی زانیارییەکانی حکوومەتی یەمەن، سعوودیە بە بەرنامە ئەو دەرمانانە دەنێرێتە یەمەنەوە، چونکە گەر کاری مافیاکان بێت، بۆچی 70 جۆری دەرمان کە لە سعوودیەوە دەچێتە یەمەن، هیچی لە خودی سعوودیەدا پەخش نابێت. هەروەها دیسانەوە میسریش لە دژی سعوودیە ئەم کارە دەکات و بوەتە سەرچاوەی دەرمانە قاچاخ و نایاساییەکانی ولآتی سعوودیە. بەو بۆنەیەیشەوە ئەو ناڕەزاییەی کە یەمەنییەکان لە سعوودیەیان هەیە، سعوودیەیش لە یەمەنی هەیە. کەواتە بەشێک لە برەوی قاچاخچێتیی دەرمان لە دەستی خودی دەوڵەتان خۆیاندایە

و ئەوان بوونەتە سەرچاوەی جەنگێکی سیاسیی دژ بە یەکتر و بەشێک لە جەنگە سیاسییەکەیان بە تێکدانی شیرازەی تەندروستیی یەکتری دەکەن.

8. خاڵێکی تر کە زۆر جێگەی بایەخە بریتییە لە ململانێی کۆمپانیاکانی دەرمان، کۆمپانیاکانی دەرمان ئەوانەی فەرمی و مۆڵەتپێدراون، بۆ خۆیان بوارێک بۆ کاری قاچاخ دەهێڵنەوە، چونکە بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی وەزارەتی تەندروستیی سعوودیە، ئەوە خوێنراوەتەوە کە دەرمانی قاچاخ لە وڵاتەکەیان سەرچاوەی گەلێ نەخۆشیی کوشندەیە، کە وەهای کردوە بەشێک لە داهاتی سعوودیە بۆ ناردنەدەرەوەی هاوڵاتییان و بۆ کڕینی دەرمانی کوالیتیی بەرز و گران بەها بێت. بەرنامەی دوورمەودای ئەو کۆمپانیایانەی دەرمان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بە دەرمانی نافەرمی و کۆپیکراو و ساختە ژینگەی نەخۆشی و شێواندنی ڕەوشەکە دەهێنێتە پێش و دواتر ئاتاج بە دەرمانی کۆمپانیاکان لە کۆی کۆمەڵگە نەخۆشەکاندا زۆرتر دەبێت. ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە نیازی لەم جۆرە لە ئەجێندای کۆمپانیاکانی دەرماندا هەن ئێجگار مەترسیدارن.

ڕووسیا بەردەوام سەرکۆنەی گەلێ لە کۆمپانیا دەرمانییەکانی ئەمەریکا دەکات کە کاریان بڵاوبوونەوەی ڤایرۆس و درم و دەردی لە پڕە، بۆ ئەم مەبەستەیش ئاتاجی دەرمان و بەرهەمی دەرمانی ئەو کۆمپانیایانە زۆر لە پێش چاو دەبێت. ئەم ڕەوشە دیوێکی زۆر مەترسیدارە و بوونی کۆمپانیای نایاسایی دەرمان لە ئەجێندای بەشێک لە وڵاتان بە دەر نابێت، هەر بۆیە خوێندنەوە بۆ کاری بازرگانی و قاچاخچێتیی بواری دەرمان هەڵگری گەلێ ڕەهەندی ترسناکە بە تایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا هێندەی پەنجا ساڵی ڕابردوو ئەم بوارە بایەخی پەیدا کردوە و بوەتە جێی سەرنج و لەم ڕێوشوێنە پێشکەوتوەی کۆنترۆڵی سنورەکاندا بە پێچەوانەوە بوارەکە زیاتر فەراهەم هاتوە و زۆرتر دەبێت، هەر بۆیە بوونی قاچاخیی بواری دەرمان و مادەی بەسەرچوو و دەرمانی پزیشکی کۆپیکراو، بوونێکە تەنها خۆی لە کاری کۆمپانیا و ڕێکخراوە تاوانکارەکان نابینێتەوە، بەڵکوو تێکەڵە بە ئەجێندای سیاسی و نیازی ئابووریی بەرنامەبۆداڕێژراو، کە بەشێکیان لە هەناوی یاساکانەوە سەرچاوەیان گرتوە.

ئەو وڵاتانەی کوالێتیی دەرمان دروستکردن لە ناویدا یەکجار نزمە و تا ڕادەیەکی زۆریش کۆنترۆڵی ئەو جۆرە تاوانەیان پێ ناکرێت بە هۆی بارودۆخی ئەمنی و باری ناسەقامگیری وڵاتەکانیان. ئەوانیش بریتین لە:

**لوبنان:**

لوبنان لە سەر هەموو ئاستەکاندا هەر لە دوای سەربەخۆبوونیەوە، کەوتوەتە ناو ململانێیەکی توند و هەمیشە کاریگەر دەبێت بە دەوروبەری، بە تایبەتیش پاش تەقینەوەی ڕووداوەکان لە سووریا و هاتنی نزیکەی یەک ملیۆنونیو پەنابەر بۆ ناو خاکەکەی. ئەو وڵاتە خاوەن سیستەمێکی سیاسیی تائفیی گەندەڵ و ژینگەیەکی سیاسیی پیس و کەلتوورێکی گەندەل، ئەمەیش وای کردوە لوبنان بچێتە بکەوێتە ڕیزبەندی 136 وڵات لە کۆی 176 وڵات لە ڕووی گەندەڵییەوە. ئەو دیمەنە وای لە لوبنان کردوە ببێتە سەرچاوەی هەناردەکردنی دەرمانی ساختە، کە هاوڵاتییانی بە دەستییەوە دەناڵێنن، بۆ ناوچەکانی: سووریا، عێراق و سعوودیە

به تایبەتییش کاتێک میلیشیاکانی لەگەڵ یەک دەجەنگان لە حەفتا و هەشتاکاندا کۆنترۆڵی سەرجەم بەندەرە ئاوییەکانی کرد، بەڵام دوور لە کاریگەرییەکانی جەنگی ناوخۆیی لە لوبنان، کەچی کاری مافیاییی دەرمان و بە پەردەیەکی شەرعییش بەردەوام بوە، کە وای کردوە ڕۆڵی دەزگاکانی چاودێریی ئیفلیج بکات و پەکی بخات و نەتوانێت بە تەواوی کارەکانی ڕابپەڕێنێت.

سیاسەتی دەرمان و بەبازاڕکردنی لە لوبنان

ــ نەبوونی ئیرادەیەکی سیاسی بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی نیشتیمانی بۆ دەرمان هەر لە دوای سەربەخۆبوونەوە.

ـ هەژموونی کۆمپانیاکانی دەرمان بە سەر بڕیاری تەندروستی، چونکە هەندێک کۆمپانیا هەن زۆر بەهێزترن لە وەزارەتی تەندروستی.

ـ نزیکبوونەوەی ماجەی دەرمان بە زهنیەتی بازرگانی و مافیایی. دیارە چەندین ساڵە ئەو مافیایانە توانیویانە بە تەواوی لەمپەر بخنە بەردەم کاروباری تەندروستی.

ــ بازرگانانی دەرمان لە 80 ــ 90% بازاڕەکانیان قۆرخ کردوە.

هەر دوای تەقینەوەی ڕووداوەکانی سووریا،

یاریکەرانی بازرگانیی دەرمان لە لوبنان بە دەرخستنی هەستی مرۆییبان، وایان کرد سەرجەم جۆرەکانی دەرمانی ساختە بە لێشاو بۆ سووریا ڕەوانە بکرێت بە ڕێگەی سنورەکان و دەڵاڵەکانی سووریایی.

**عێراق:**

هیچ وەسفێک نییە بۆ نەهامەتیی گەلانی عێراق سەبارەت بەو تاوانە.

- هەر لە دوای 9ی نیسانی 2003ەوە نزیکەی 140 هەزار حاڵەتی تووشبوو بە شێرپەنجەی نوێ دەستنیشان کرا لە عێراق بە هۆی یۆرانیۆمی پیتێنراو.
- لە ماوەی گەمارۆیەکەی سەر عێراق لە ساڵی 1991، بازرگانانی مردن لە سووریا و لوبنانی ئەو هەلەیان قۆستەوە و بازاڕەکانی ئەو وڵاتەیان پڕ کرد لە دەرمانی ساختە، زۆربەی جاریش لە کوردستانەوە ئەو دەرمانانە دەهێنرانە ژوورەوە.
- لە 2000/9/26، کەشتییەکی بەریتانی دەرمانی نەخۆشییەکانی تەنگەنەفسی بۆ عێراق دەگواستەوە بە ڕێگەی لوبنان (بەگوێرەی ڕێکەوتنی نەوت بەرانبەر خۆراک و دەرمان)

بەڵام ئەو دەرمانانە لە لوبنان فرۆشران و بوە هـۆی مردنی زیاتر لە 10 هـەزار عێراقی بە هۆی کەمیی دەرمـان و بە تایبەتییش جۆری Inhalers.

لە کاتی ئێستادا قەبارەی بازاڕی دەرمانی ساختە لە عێراق دەگاتە یەک ملیار دۆلار ساڵانە. دەرمانخانەکانی بەغداد و شارەکانی تریش پڕ لە دەرمانی هیندی و چینی و تاد.

**میسر:**

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی پرسیارێکی مەترسیدار و سەرنجڕاکێشی کرد: ئایا دەرمانی ساختە لە کاری تیرۆریستیدا بە کار دێت.

ئاژانسی خۆراک و دەرمانی ئەمەریکی FDA بە نەبوونی زانیاری لە سەر هیچ ڕووداوێک لەو جۆرە وەڵامی دایەوە، بەڵام جەختی کردەوە لە سەر بەدواداچوون بۆ ئەو مەبەستە.

دواتـر گۆڤاری (ڕوز یوسـف)ی میسری لە 24 ئابی 1998 بە ڕاپۆرتێک وەڵامی دایەوە، کە کۆمکاری عەرەبی لە قاهیرە بڵاو کردبووەوە و تێیدا باس لەوە دەکات، کە کۆمپانیایەکی جیهانی بۆ ئامادەکردنی (کیسی گواستنەوەی خوێن)ی لە خۆ گرتوە و ڤایرۆسی (هەوکردنی جگەر و پەتای

(b) لێیەوە پەیدا بوە و بۆ میسر ڕەوانە کراوە.

ئەمە نموونەیەک بوو لە سەر تیرۆرکردن. لێرەدا پرسیارە گرینگەکە دێتە ئاراوە، ئایا کێ گرەنتیی ڕوونەدانی تاوانێکی لەو جۆرە دەکات؟

لە دەیەی ڕابردوو، جۆرێتیی دەرمان زۆر لە پاشەکشە دابوو بە هۆی گەندەڵی و ناسەقامگیریی دۆخەکە و باری ئابووری و بەرزبوونەوەی نرخی دەرمان بە ڕادەیەکی یەک جار بەرچاو. ئەمانە هەمووی هۆکار بوون لە سەر پەیدابوونی دەرمانی ساختە و کڕینی لە لایەن چینی هەژار و بێدەرتان.

**سعوودیە:**

هەر لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، سعوودیە بەردەوام ڕووبەڕووی چەندین جۆر شێوەی دەرمانی ساختەکار بوەتەوە. بەڵام بە پێی سەرچاوەکانی سعوودیە، لوبنان لە هەموو وڵاتێک زیاتر هەناردەی دەرمانی ساختە دەکات بۆ ئەو وڵاتە.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە، چەندین لایەنی پێوەندیدار بەو پرسە، دەرکەوتوە لە 25% دەرمانەکانی لەو وڵاتە دەفرۆشرێن و لە بازاڕەکانی سعوودیەدا هەن، دەرمانی ساختەن.

# کابوسی دەرمان و باندی بازرگانی و مافیا تاوانکارەکانی دەرمان

## شرۆڤەی گەشەی مافیا تاوانبارەکان و تاوانی دەرمانسازەکان

**دوا ڕاپۆرتی ئینتەرپوڵ لە بارەی دەرمانی ساختە و قاچاخەوە:**

تاوانی دەرمانسازەکان جیا لە هەموو فۆرمەکانی تری تاوان، مەترسییەکی مەزن لە سەر تەندروستیی کۆی کۆمەڵ دروست دەکات. دەرمانی ساختە و بازرگانی بە شێوەیەکی هێواش باوەڕ و متمانەی خەڵکی

به کۆی سیستەمی چاودێریی تەندروستی لەق دەکات، چونکە بازرگانیکردن بە دەرمانەوە و دزەکردنی دەرمان بە شێوەیەکی نایاسایی، دوا جار دەردێکی ئالوودەبووی جەستەی کۆمەڵ و خەڵکی هەژار و نەدارە و کۆی گشتیی تەندروستیی هەر کۆمەڵێک داغان دەکات. لێرەدا پاڵنەرەکانی تاوان و خواستی مادە و قازانج زەمینەیەکی لە بارن بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بەرفراوان دەرمانی نایاسایی و قاچاخ و ڕێپێنەدراو دزە بکەنە نێو کیشەوەرەکانەوە، ئەم ڕەوشە لە بەرهەمهێنانی دەرمانەوە تا فۆرمەکانی دابەشکردن و ساغکردنەوە بە پرۆسەیەکی یەکانگیریی تاواندا تێپەڕ دەبێت. قاچاخچێتی لە بواری دەرماندا هەمان ترس و تۆقینی قاچاخچێتیی مافیاکانی مادەی هۆشبەر و کڕین و فرۆشی مرۆڤی بۆ سەر ئاییندەی تەندروستیی مرۆڤ هەیە. لەم ڕووەوە بەشی بەرهەمە ساختەکانی بواری پزیشکیی لە ئەنتەرپول و تاوانی دەرمانسازیدا زانیار ی و داتاکەلێکی گرد کردوەتەوە و شرۆڤەی

لە بـارەوە كـردوون، ئـەم توێژینەوەیە بە پشتبەستن بەو زانیارییانە لە 2008ـەوە تا ئـەمڕۆ شـرۆڤـەی ئـەو ڕەوشـــەی كـردوە كە لە جیهاندا دەگوزەرێت. لەم ڕووەوە ڕادەی چالاكیی ڕێكخراوە تاوانكارەكان OCGs و باندەكانی لە هەمبەر تاوانی دەرمانسازی و قاچاخی دەرماندا خستوەتە ڕوو.

لە بەشەكانی خوارەوەدا سەرنجێكی گشتی لە سەر متۆدی كاركردنی ئەم شیكارە زانستییە ڕوون كـراوەتـەوە. هـاوكـات پێناسەگەلێكی دیاریكراو لە هەمبەر ئاشنابوون بە پێكهاتە و چییەتیی ئەو ڕێكخراوە تاوانكارانە نیشان دراوە كە لە بواری تاوانی دەرمانسازی و قاچاخچێتیی دەرمـانـدا تێوە گـلاون. لە كۆتاییشدا ئاستی گرفتەكانی تاوانی دەرمانسازی و قاچاخچێیی دەرمان خراوەتە ڕوو، هاوكات ئاڕاستەی ئەم پیشە نایاساییە و دەرهاویشتەكانیشی شی كـراونـەتـەوە. جگە لـەوەیش سەرنج دراوەتـە سەر زەمینەسازییەكانی ئەم بوارە كە لە ئاستی گـەندەڵـی و كەموكوڕیی یاسا و ڕێساكانی وڵاتەوە سەرچاوەی گرتوە.

### 1. میتۆلۆژی:

بۆ مەبەستی ئەم توێژینەوەیە سێ سەرچاوەی سەرەکیی زانیاری کەڵکیان لێ وەرگیراوە: یەکەم، ڕاپرسی و وەڵام. دووهەم، سیستەمی داتابەیسی ئینتەرپوڵ (ICIS) سێهەم، سەرچاوە میدیایی و هەواڵییەکان. لە ڕاپرسییەکاندا ئاستی تاوانەکانی دەرمان و دەرمانسازیی لەو وڵاتانەی کە ئەندامی ئەنتەرپوڵن لە 2008ـەوە تا ئێستا کەڵک لە تێگەیێشتنیان بۆ ئەو پرسە وەرگیراوە لە ڕێگەی پرسوجۆ و ڕاپرسییەوە. زانیارییەکانی پەیوەست بە سروشتی گروپە مافیا و تاوانکارە ڕێکخراوەییەکانەوە، وەک ڕێگە و نەزمی کارکردن و ئاستی چالاکییان و پێکهاتەی ڕێکخراوەییان. هاوکات ئاست و ئامادەیی ئەو یاسا و ڕێسا دەرکراوانە کە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی جەنگی ڕێکخراوەکانی دەرمـــان دەبـــنـەوە. ڕاپـرسـیـیـەکـە لـە 190 وڵاتـی ئەنتەرپوڵدا ئەنجام دراوە. هـەروەهـا تۆڕەکانی وەک ئەنجوومەنی هەمیشەیی تاوانە نێونەتەوەییەکانی دەرمان (PFIPC) سەرانی گروپی کار و ئاژانسەکانی دەرمان لە تاوانی

بەڕێوەچوونی نێودەوڵەتیدا (HMA WGEO) دامـــەزراوەیـــی ئـاسـایـیـشـیـی دەرمـانـسـازیـی (PSI) هەموو ئەوانە تۆڕگەڵیکی پەیوەست بە زانیارییەکان بوون، لەگەڵ ئەوەیشدا زانیارییەکی فەرەبەسود لە ڕاپرسـی و پرسوجۆکاندا بە دەست گەییشتوون. ڕاپرسییەکان تەواوکەری ئەم و ئەو شرۆڤە و شیکارانە بوون کە لە ئاستی هەرێمی و نێودەوڵیدا پەیوەست بـەم پرسە ئەنجام دراون. لە ئاکامەکانی ڕاپرسییەکانەوە توانیومانە ئاکامەکانی توێژینەوەکە بخەینە ڕوو، ئەمانە هاوکات لەگەڵ خزمەتگوزاریی زانیارییە کیمیاییە سـەربـەخـۆکـان ICIS و بـابـەت و وتارەکانی ڕاگەیاندن هەر دووکیان لە ڕێگەی چاودێریی پەیوەست بەو زانیارییانە بە دەست گەییشتوون.

## 1. 2. پێناسەکان

### 1. 2. 1. گروپی تاوانی ڕێکخراو (OCG)

بـۆ مـەبـەسـتـی ئـەم تـوێـژیـنـەوەیـە، گروپی تـاوانـی ڕێـکـخـراو بـە گـوێـرەی مـادەی دووی ڕێککەوتنی نەتەوەیەککرتووەکان لە 2000دا

پێناسە کراوە، بە تایبەت ئەم مادەیە پەیوەستە بە پێناسەی گروپە ڕێکخراوەییە تاوانکارە نێونەتەوەییەکانەوە. ناساندنیان بەم جۆرەیە:

گروپێکی پێکهاتوو لە 3 کەس یان زیاتر، لە ماوەیەکی کاتیدا خۆی دەبینێتەوە و پێشینەیەکی دەبێت، هەروەها بە هەماهەنگی دەست دەداتە کار و چالاکی بۆ ئامانجی تێوەگلان لە تاوانێک یان چەند تاوانێکی ترسناک و یاساغ، ئەمەیش لە پێناو ئەوەدایە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سودێکی دارایی یان مادیی تر بە دەست بهێنێت.

لێرەوە تێدەگەین کە ئەم گروپە تاوانکارە ڕێکخراوەییانە گونجاون لەتەک ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە.

1. کارکردنی دەستەجەمعی، گروپێک تاوانکار پێکەوە کار دەکەن.

2. پێکهاتەی گروپ، لە شێوەیەکی هەرەمیدایە و هەر تاکێک لەو گروپەدا لە سەرەوە بۆ خوارەوە خاوەنی ڕۆڵ و تایبەتمەندیی جیاجیایە.

3. چالاکیی بەردەوام، لە گروپێکدا چالاکیی بەردەوام بۆ ماوەیەکی بەرچاو و دیاریکراو

دەبێتە مۆرک و پێناسە و تایبەتمەندیی ئەو گروپە.

4. قازانجی زۆروزەبەند، لە گروپەکاندا قازانجی گەورەی مادی لە چالاکییەکانەوە بە دەست دێت.

2. 2. 1. تاوانەکانی دەمانسازی چی لە خۆ دەگرێت، لەم توێژینەوەیەدا کۆی تاوانەکانی بواری دەرمان و دەرمانسازی دەخەینە ڕوو کە ئەم گرفتانەی خوارەوە لێیەوە سەرچاوە دەگرن.

لەگەڵ ئەوەی بە پێی ڕێسا و یاسا نیشتیمانییەکان لادان و یاساغییە، ئەم دیوە نەرێنییانەی خوارەوەیشی لێ دەکەوێتەوە:

چێکردن یان دەرمانسازی و دابەشبوونی دەرمان بە شێوەیەکی ساختە و بازرگانی، کە دەرمانی ساختە و کەلوپەلی پزیشکیی ساختە و ئامێرە ساختەکانی پزیشکیی لە خۆ دەگرێت، هەموو ئەوانە لە ڕێگەی پرۆسەیەکی یاسایی و نایاساییەوە دزە دەکەنە نێو کۆمەڵ و کەرتی تەندروستییەوە. لەو بێ بەرنامەییەی بواری

دەرماندا ئەم ڕێوشوێنانەی خـوارەوە ڕۆڵیان هەیە.

1. دزی
2. ساختەکاری
3. گەندەڵی
4. زێدەڕۆیی و ڕیکلامی ناڕاست
5. بازرگانیی یاساغ
6. قاچاخچێتی
7. سپیکردنەوەی پارە

2. ئەنجامە سـەرەکییـەکـان: تـاوانـەکـانـی دەرمان و گروپەکانی تاوانی ڕێکخراوەیی

ئامانجی سـەرەکیـی لـەم تـوێـژینـەوەیـەدا بۆ ئەوەیە کە ئاستی بەشداری و تێوەگلانی ڕێکخراوە تاوانکارەکانی بواری دەرمان دیاری بکەین و بزانین کامانەن ئەو ڕێکخراوانە کە شوێندەستیان لـەم بـازاڕە ڕەشـەی دەرماندا دیارە. نزیکەی 10% ی وەڵامی ڕاپرسییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکـەن کە هەموو ئەو گروپە کلاسیکییانە بە شێوەیە هەرەمی تێوە گلاون. زۆرترینی وەڵامەکانیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن،

که تاوانەکانی بواری دەرمان و دەرمانسازی لە پێشەنگی هەموو ئەو تاوانانەی تردان کە تۆڕەکانی تاوان بە شێوەی نایاسایی دەستیان داوەتێ. لە ناو ئەو ڕێکخراوانەدا دوو ڕێکخراوی ئاشنا و دیار هەن، کە هەر یەکێکیان لە ئاسیا و باکووری ئەمەریکادان، ئەم دوو ڕێکخراوە ڕێکخراوی تاوانکاریی بواری دەرمان و دەرمانسازیی پزیشکین. سەرەڕای ئەوانەیش باند و مافیا ماتۆر سوارەکان بۆ نموونە (فریشتەکانی دۆزەخ) ئەمانە ناسراون بە بازرگانی و قاچاخچێتیی بواری دەرمان لە هەر دوو وڵاتانی باکووری ئەمەریکا و ئەسکەندەنافیادا. هەر یەک لەم سێ گروپە تاوانکارەی بواری دەرمان بە پلەی یەکەم پێشینەیەکیان لە بواری تاوان و سەرپێچی تر هەیە، لەوانە قاچاخچێتی لە بواری مادەی هۆشبەر و چەک و چۆڵی سەربازیدا، ئەوە لە کاتێکدا قاچاخچێتیی ئەم گروپانە بۆ بواری دەرمان و دەرمانسازیی فرە سنووردار کراوە. جیا لەو نموونانەی سەرەوە کە ئاماژەمان پێ دان، زۆرێک لە ڕێکخراوە تاوانکارەکانی تر و

باند و مافیا بەناوبانگەکان نەیانتوانیوە بە سانایی تێکەڵ بە ژینگەی دەرمان و قاچاخچێتیی بواری دەرمـان ببن. لێرەدا دوو جۆر لە ڕێکخراوە تاوانکارەکان هەژموونی تەواویان بە سەر ئەو بوارەدا هەیە:

1. تۆڕێکی نێونەتەوەیی کە تا ئاستێکی باڵا ڕێکخراو و تۆکمەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نافەرمی و یاساغە، ئەم تۆڕە ڕێکخراوەییە هەڵدەستێت بە فرۆشتنی دەرمـان لە ڕێگەی ئەنتەرنێت بە شـێوەی ئۆنلاین، ڕێکخستنی تۆڕەکەی هیچ مۆڵەتێکی نییە و نایاساییە.

2. گروپە گچکەکان، ئـەم گروپانـە زۆر دامـەزراوەیـی نیین و ئەندامەکانیان لە نێوان 3 تا 10 ئەندام دەبن، ئەوانیش بە شێوازی جۆراوجۆر لە تاوان و قاچاخچێتیی دەرمانی نایاساییدا تێوە گلاون.

پێکهاتەی ئـەو گـروپ و ڕێکخراوانەی کە تێوە گلاون لە قاچاخچێتی و بازرگانیی بواری دەرمـانـدا، لـەم ڕێگە و شـێواز و فۆڕمانەی خوارەوەدا چالاکییەکانیان بەرجەستە دەبن:

### 1. 2. پێوەرەکانی چالاکی

1. 1. 2. زیادبوونی ئاستی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە بارەی تاوانی دەرمان و دەرمانسازییەوە.

هەموو ئەو ئاماژانەی کە باس لە زیادبوونی تاوانەکانی بواری دەرمان و قاچاخچێتی دەکەن، زیاتر لە قەبارەی ڕاگەیاندنەکانەوە سەرچاوە دەگـــرن، بـە تـایبـەتـی کـە بـەڕێوەبـەرایـەتـیـی ئەنتەرپولMPCPC ئاماژەی وردی بەم بوارە داوە. ئەم زیادبوونە دەکرێت وابەستە بێت بەو بایەخە فرەیەی کە میدیاکان لە سەر ئەم پرسە هەیانە. یـان پێوەندیدارە بـەو ڕێوشوێنانەی کە دەسـەڵاتـداران دەیگرنە بەر بۆ سەرکوتی ئەم جۆرە قاچاخچێتییەن، ئەمەیش وا دەکان میدیاکان وەک هەواڵێک بایەخی تـەواو بەم بوارە بدەن. تەنها لە میانی 2013دا، ئینتەرپوڵ هاتوە چەند کەیسێکی دیـار و بـەرچـاوی لە سەرانسـەریی جیهاندا تۆمار کردوە، هەموو ئەو کەیسانەی ئینتەرپوڵ بە جۆرێک لە جۆرەکان وابەستەن بە مافیاکانی بواری دەرمانەوە، بۆ نموونە:

### ئەفریقا

لە مانگی پێنجی 2013 دا کەسێک قۆڵبەست کرا، ئەم کەسە مژوڵ و سەرقاڵی قاچاخچێتیی بـواری دەرمـانـی ساختە بـوو لـە چینەوە بۆ لاگۆسـی پایتەختی نـەیـجیریا. هـەمـوو ئـەو دەرمـانـە یاساغ و ساختانەی کە بـەو کەسە گیران بریتی بوون لە ئیبوبروفین و مالوکسین و کۆرتیم. ئەو گومانلێکراوە کە لە نەیجیریا دەستگیر کرا، بە هیچ شێوەیەک نەیتوانی ناوی تەنها گومانلێکراوێکی چینی بهێنێت کە لەو کیشوەرەوە تێوە گلابێت لە قاچاخچێتیی بواری دەرماندا، بەڵام بە ڕادەی دەرمان و قەبارەی قاچاخچێتییەکەیدا و بە شێوازی کارەکەیدا ئەوە ڕوون بوەتەوە کە ناوبراو وابەستەیە بە باندێکی نێونەتەوەیی بواری دەرمان.

### ئاسیا

لە مانگی ئـازاری 2013ـدا دەسەڵاتدارانی فلیپین ئـەوەیـان ڕاگەیاند، کە پێنج قاچاخچیی دەرمانیان دەستگیر کـردوە، ئـەوان لە هەوڵی چالاکییەکدا بوون و لە سەنگافورەوە حەبی ڕێگریی

لە منداڵبوون و ئازارشکێن و ئەنتی بایۆتیکیان هێناوەتە فلیپین و لە ڕێگەی ماشێنی بارهەڵگری قەپاتەوە هێناویانە، هەر بۆیە بەرپرسانی گومرکی دەستیان گرت بە سەر بڕێکی زۆر لەو جۆرە دەرمانە قاچاخ و ساختەی کە هێنرابوو. لەم بارەیەوە پێوەندییەکانی کۆمپانیا بازرگانییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو هەوڵە پێوەندیدارە بە مافیا یاساغەکانی بواری دەرمانەوە.

هەروەها لە نێوان ساڵانی 2011 تا 2013 گروپێکی مافیایی ناسراو بە ئازوما غومی Azuma-Gumi، هەستاوە بە فرۆشتنی دەرمانی ساختە و بێبنەما، لەوانە ڤیاگرا و سالیس و لیڤیترا بە تایبەتی لە ئۆسۆکا، یابان دا. پەیوەست بە دۆسیەی ئەو گروپە مافیاییەوە دەسەڵاتدارانی یابانی ئەوەیان خستە ڕوو کە 6 کەسی پێوەندیداریان بەو پرسەوە قۆڵبەست کردوە.

**ئەورووپا**

لە مانگی شەشی 2013 دا و لە میانی پرۆسەیەکی ئینتەرپوڵدا پەیوەست بە دەرمانی قاچاخ بە ناوی Pangea VI، لەو پرۆسەیەدا

دەسەڵاتدارانی ڕووسیا ئەوەیان دووپات کردەوە کە توانیویانە لە میانی پرۆسەکەدا چالاکییەکی بەرفراوانی دەرمانی ساختە کە چەند ساڵێکە مافیاکان پێوەی سەرقاڵن لە ناو ببەن، ئەم چالاکییە لە ڕۆستۆڤدا لە نێو براوە. دەرمانی ساختە و بێ بنەما و کۆپیکراوی وەک Herceptin، Meronem، Sulperason، Mantera، Cefobit لە لایەن دەرمانسازە نایاساییەکانەوە دروست دەکرا و پاشان لە بازاڕی ڕەشدا دابەش دەکرا و دەفرۆشرا، هەموو ئەو پرۆسەیەیش لە لایەن مافیاکانی دەرمانەوە ئەنجام دەدرا و هەوڵی تاکەکەسی نەبوو. بە شێوەیەکی گشتی دەسەڵاتدارانی ڕووسیا لە میانی 23 هەڵکوتان و هەڵمەتی لەناکاو و بە بەرنامەدا توانییان 6 گومانلێکراوی پەیوەست بەو دۆسییەیە قۆڵبەست بکەن.

### زەرپاییەکان

لە مانگی 4ی 2013 دا سەرچاوەیەکی ئاشکرا ئەوەی بڵاو کردەوە کە 3 گومانلێکراو

بە تۆمەتی کاری قاچاخ و ساختەکاری لە بواری دەرمانی تادالافیل لە کرایستشیرش نیوزلەندادا دەستگیر کراون. هاوکات ئەوەیش ڕاگەیەنرا بوو کە سێ گومانلێکراوەکە سەر بە ڕێکخراوێکی یاساغ و تاوانکارن و بە تۆمەتی بڵاو کردنەوە و سەرۆکاریی دەرمانی قاچاخ قۆڵبەست کراون. هەمان سەرچاوە ئەوی خستە ڕوو کە سەرۆکی باندە دەستگیرکراوەکە سەرپەرشتیی تۆڕێکی ئاڵۆز و پڕۆفیشناڵی کردوە لە بواری بەرهەمهێنانی دەرمان و تاقیگەی پێشکەوتوو، هەروەها ڕیکلام و لیست و ناونیشان و تایتڵی دەرمانی ساختەی داوەتە دابەشکاران.

### ئەمەریکای باشوور

لە دەستپێکی 2013 دا بەرپرسانی پۆلیسی کۆڵۆمبیا ئەوەیان ڕاگەیاند کە 21 گومانلێکراویان لە ئۆپەراسیۆنێکدا لە کەناراوەکانی ئەتڵەنتیکی کۆڵۆمبیا قۆڵبەست کردوە. لەو ئۆپەراسیۆنەدا تێکڕا 89754 یەکەی دەرمانی ساختە بە گوێرەی بڕیاری یاسا و ڕێساکانی ئەوێ دەستیان بە سەردا گیرا. ئۆپەراسیۆنەکەکە

ناودەبرا بە 'República DIPON' پێکهاتبوو لە 21 پشکنین و یادخەرەوەی چڕوپڕ بۆ شارەکانی سینسیلیج و مونتیرا و سانتا مارتا و لیدز. ئەو باندانەی کە دەستگیر کران سەر بە ڕێکخراوە تاوانکارە نێونەتەوەییەکان بوون، ئەوان لە لایەن زنجیرە سەردارێکەوە هەستابوون بە ساختەکردنی ناوی دەرمان و مێژووی بەسەرچوون و دانانی کوالیتیی بەرز بۆیان بە شێوەیەکی ساختە و ناڕاست.

هەروەها لە مانگی شەشی 2013 دا سەرچاوەیەکی فەرمی ئەوەی خستە ڕوو کە 10 تۆمەتبار لە ئۆپەراسیۆنێکدا لە گواتیمالادا دەستگیر کراون. ئەمانیش بریتی بوون تاوانکارەکانی سەر بە ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی دەرمانی ساختە و قاچاخ. گروپەکە لە لایەن کەسێکەوە ڕێبەرایەتی دەکرا کە بۆ خۆی لە کۆمپانیایەکی ڕێپێدراوی دەرماندا کاری دەکرد. لێرەوە کاری کردبوو تا مۆڵەتی بەرهەمهێنانی دەرمان و کاری دەرمانسازی بکات. کۆمپانیاکان سودیان لە ڕووپۆشێکی یاسایی دەبینی بۆ ئەوەی بتوانن

لە ژێر پەردەی یاسادا کاری تر بکەن و برەو بە داهات و سودی زیاتری کۆمپانیاکانیان بدەن.

### 2. 1. 2. ئاکامەکان لە ڕاپرسییەکانی ئینتەرپوڵەوە

بیروڕاکان لە نێوان وڵاتانی ئەندامی ئینتەرپولدا پۆلێن کراون، لەو پۆلێنەدا دەردەکەوێت کە ئایا لەو وڵاتانەدا ئاستی بەرهەم و چالاکیی دەرمانی نایاسایی بەرز بوەتەوە یان لە کەمبوونەوەدایە9. لەم میانەدا ڕەوشەکە بۆ هەندێک لە هەرێمەکان ڕوونترە، بۆ نموونە بۆ ئەمەریکای لاتین. لە هەموو وەڵامی ڕاپرسییەکانی ئەمەریکای باشوور و ناوەڕاستدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کە چالاکیی گروپەکان و دۆسییەکان و دەستگیرکراوەکان لەو کیشوەرانەدا لە 2008 بە دواوە ڕووی لە زیادبوون کردوە. هەروەها لەو ناوچانەدا بەردەوام کارگەی بەرهەمی دەرمانی ساختە و مێژووی ناڕاستی بەسەرچوون و ئامادەکردنی مەوادی کوالێتیی نزم و هەناردەکردنی بۆ وڵاتانی دەرەوە لەبرەودایە، بۆ نموونە ئەو

قازانج و داهاتەی لە دەرمانی نایاسایی و یاساغدا هەیە لە ئەمریکای لاتیندا دەکاتە سێ یەکی کۆی ئەو سود و قازانجەی کە لە دەرمان و دەرمانسازیی یاساییدا هەیە. ئەم ڕەوشەیش لە 2008ـەوە تا 2012 بەم شێوەیە هاتوە و لەو ڕێکەوتە بە دواوە ڕەوشەکە بە شێوەیەکی ترسناکتر بەردەوام بوە و دەبێت. بۆ نموونە فرۆشی دەرمانی ڕێپێدرا و یاسایی لە ئەمریکای لاتیندا خەملێنراوە بە 100 ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بۆ ساڵێک، لە هەمان کاتدا فرۆشی دەرمانی نایاسایی و یاساغ لە ئەمەریکای لاتیندا بریتییە لە 30 ملیۆن دۆلار. لەگەڵ ئەوەیشدا دەرمانی ساختە نایاسایی لەو کیشوەرەوە بۆ بەشەکانی تری جیهان نێرراوەتە دەرەوە و کەڵکێکی تەواو لە ئەنتەرنێت وەرگیراوە و بە شێوەیەکی ئۆنلاین بواری فرۆشی دەرمانی ساختە و نایاسایی دەروویەکی بەرفراوانی لە بەردەمدا کراوەتەوە. دەسەڵاتدارانی گومرگی ئەمەریکای باشوور باس لەوە دەکەن کە تەنها لە یەک وڵاتدا 1000 فرۆشیاری دەرمان لەوێوە بۆ وڵاتانی ئاسیا مژوڵی کاری نایاساییین. لە

2013 و 2012 دا بەرپرسانی گواتیمالا هەڵسان بە دەستگرتن بە سەر ژێرزەمینێکی شاراوەی دەرماندا، لەوێدا کۆگایەک هەبوو کە دەرمانی خۆماڵی و ساختەی بواری پزیشکی بەرهەم دەهێنا، هەر بۆیە لەو هەڵمەتەی پۆلیسدا تەواوی ئەوانە دەستگیر کران، لەو کۆگایەدا هەموو ڕێوشوێنە پێشکەوتوەکانی بەرهەمهێنان و بواری دەرمانسازیی بەردەست بوو. ئەم بواری دەرمانسازییە لە ئەمەریکای لاتیندا وەک پیشەیەکی لێهاتوون زیاتر خەڵکی یاخی و بێکار و سەرچڵ و گەنجانی سەربزێو پەنای بۆ دەبەن، چونکە لە ڕوانگە یاساییەکەیدا کۆتوبەندی فرە لە سەر ئەم کارە هەیە، هەر ئەمەیش وای کردوە هەمیشە بەرنامەداڕشتن بۆ کاری دەرمانی ساختە و قاچاخیی دەرمان هەم سودێکی فرەی هەیە هەم پلانی ورد و تاکتیکیی شاراوەی زۆری دەوێت، بۆیە بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی کە ئەم کارانە دەکەن لە ئاستێکی زۆر بەرزی وردەکاریدا دەست پێ دەکەن و شارەزاییەکەی تەواویان لە کاری ساختەکاریدا هەیە، ئەو کارە ساختەکارییە لە

لای باند و مافیاکانیش زۆر برەوی پێ دراوە و توانیویانە خۆیان لە ڕێوشوێنەکانی پۆلیس و دەوڵەت ببوێرن.

هەروەها لە ئەورووپا و ئەمەریکای باکووردا چەند لێکۆڵینەوەیەک کە لە کەنەدا و سوید و ئەمەریکادا وابەستەن بە فریشتەکانی دۆزەخەوە، ئەوانە کاریان بریتییە لە دروستکردن و دابەشکردنی دەرمانی ساختە، بۆ ئەم مەبەستەیش خاوەنی تاقیگە و کۆگا و ژێرزەمینی نهێنی و پسپۆڕی پێش کەوتوون لەو بوارەدا. هەر لە ئەورووپادا مافیا و باندەکانی دەرمان کارێکی تر دەکەن کە بریتییە لە کاریی ڕێگری و هەڵکوتانە سەر بارهەڵگرەکانی دەرمان و ڕێگریکردن لێیان و بەتۆپزی ڕووتاندنەوەیان. ئەم کارەیش لە 2010 وەک دیاردەیەک لەو کیشوەرەدا دەبینرێت، بەم شکڵە جۆرەکانی دەرمانی پزیشکییان دەست دەکەوێت و بە شێوازی جیاجیا بۆ خۆیان لە بازاڕی ڕەشدا هەم ساغیان دەکەنەوە، هەمیش کاریان لە سەر دەکەن بۆ کۆپیکردن و ساختەکاری. لێرەدا چەند ڕاپۆرتێک لە بارەی هەندێک لە وڵاتانی ئەندام لە

یەکێتیی ئەورووپادا بڵاو کراونەتەوە کە گەلێ لە بەرهەمە دزراوەکان لە نێو کۆگا فەرمییەکانی دەرماندا دۆزراونەتەوە و کۆڵینەوەی وردیان لە بارەوە کراوە. هەروەها لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا بوارێکی تایبەت بە دەرمانکاری ساختەکاریی تێدا دەکرێت، بە تایبەتی ڕێکخراوە تاوانکارەکاندا و مافیاکان هەڵدەستن بە دروستکردنی دەرمانی ساختە و کۆپیکراو، بە تایبەتی ئەو دەرمانانەی کە پەیوەستن بە کاری وەرزشی و لەشجوانییەوە. تەنانەت لە وڵاتێکی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا ئاماژە بەوە دەکرێت کە وەرزشوانەکان بۆ ئەو مەبەستە پێوەندی و پەیوەستییان لەتەک گرووپە تاوانکار و مافیاکاندا دروست کردوە. لێرەدا بەڵگەی زۆر پشتڕاست کراونەتەوە کە وەرزشوانەکان و خاوەن یانەکان و ئەوانەی پاڵەوانی گەلێ لە ئۆلۆمپیاکان بوون پێوەندیدار بوون بە مافیا و گرووپە تاوانکارەکانی دەرمانەوە. ئەوان لەم پێناوەدا سود دەبینن لە کاری ڕیکلامی و بزنسی نێو ماڵپەڕەکانی برەودان بە کاری لەشجوانی و وەرزش، بۆ ئەم مەبەستەیش دەتوانن ئەو

دەرمانەی کە هەیانە هەناردەی ئەو شوێنانە بکەن کە ڕێوشوێنەکانی گومرگ و پشکنین تێیدا لاوازە. لە سلۆڤاکیادا تۆمەتبارەکان هەڵساون بە بەکارهێنانی بارهەڵگرەکانی خواردنەو مادە کحولییەکان بۆ ئەو مەبەستە. ئەم گومانانە لەو وڵاتانەدا فرە برەوی سەندوە، بە جۆرێک لە وەڵامی ڕاپرسییەکاندا ئەوە هاتوە کە بەرهەمی دەرمانی ساختە ئێجگار ڕوو لە زیادبوونە، بە جۆرێک گەر ئەو بەرهەمە ناوخۆییانەیش لە بەر دەستدا کەم بن، زۆر بەسانایی دەتوانن لە دەرەوە بیهێننە ناوەوە، بۆ ئەم مەبەستەیش ڕێوشوێنی زۆر گونجاو دەگرنە بەر. هەر چەندە کە هەوڵگەلێکی زۆر هەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ڕەوشە، بۆ نموونە لە میانی ئۆپەراسیۆنی Pangea VI لە 2013 دا، بەرپرسانی ڕووسیا کۆڵینەوەیان لە بارەی 145 دەرمانخانەی نایاسایی کرد کە لە ئەنتەرنێتدا ڕەواجیان هەبوو. لەم میانەدا توانیان دوو گومانلێکراو و 9535 یەکەی دەرمانی ساختە دەستبەسەردا بگرن. لە کیشوەری ئاسیادا بەردەوام داواکاریی دەرمان و حەبی دابەزاندنی

کێش و کەشخەیی لە زیادبووندایە. بۆ نموونە تەنها لە ماوەی ساڵێکدا لە وڵاتێکی وەک تایلەنددا 5 ملیۆن پاکەتی حەبی دابەزاندنی کێش بە کار هێنراوە15. لە ئێستادا ئاسیا بوەتە بازاڕێکی گەورە و بەرین بۆ ڕایەڵەی بێ بەرنامەی ئەنتەرنێتی، لەو ڕایەڵەیەدا ئابووریگەلێکی تازە پێشکەوتوو لە ترۆقیدان و زەمینەی کۆنترۆڵ و لێپێچینەوە و یاسا لە لاوازیدایە، هەر بۆیە لەم زەمینەیەدا چەندین ماڵپەڕی ڕیکلام بۆ دەرمانی نایاسایی و قاچاخ لە گۆڕێدایە16، هەر بۆیە لەم ساڵانەی دواییدا چەندین دۆسییە هەن کە شایانی بیرخستنەوەن و پەیوەستن بە تاوانەکانی باند و ڕێکخراوەکانی قاچاخچێتیی بواری دەرمانەوە، بۆ نموونە ئەمانە نموونەگەلێکن لەو بارەیەوە:

1. لەم ساڵانەی دواییدا و بە تایبەتی لە 2009 دا ڕێکخراوە تاوانکارەکان بە تەواوی دەستیان گرتبوو بە سەر یانەکانی شەوانە و یانەکانی وەرزش و شوێنەکانی لەشفرۆشی، بۆ ئەم مەبەستەیش Triad بەشێک لەو کارانە لە ئەستۆدا بوە لە وڵاتێکی وەک مالیزیا. بۆ ئەم مەبەستەیش لە مالیزیادا گومانلێکراوێک وەک

و سەرۆکی Triad قۆڵبەست کرا، دەرکەوت کە کار بۆ سەندیکایەکی چینی دەکات لە کوالالامپوری پاتەختی مالیزیادا. لە کەمبۆدیایش تۆڕێکی وابەستە بە یاکوجای یابان، ئەو تۆڕە بەرنامە و چالاکییەکانی بریتی بوو لە بڵاوکردنەوە و ساغکردنەوەی حەبی ڤیاگرا. ئەم کارەیش لە کەمبۆدیادا لە ڕێگەی دەرمانخانە نایاساییەکانەوە بوون لە یابانیش بە هۆی وێبسایت و ماڵپەڕەکانەوە ئەم چالاکییانەیان ئەنجام دەدا. هەروەها لە 2011 و 2012 دا کارێکی تری ڕێکخراوە تاوانکارەکان بریتی بوو لە گەیاندنی مادەی وزەبەخش و دەرمانی گەشەی هۆرمۆنی مرۆڤ، ئەم دەرمانانە لە ڕێگەی چەند بریکارێکەوە لە چیندا بڵاو دەکرایەوە. لەم میانەیشدا بەرپرسانی پۆلیسی چین توانیان دەست بگرن بە سەر چەند کۆگایەکی دەرمان و چەند کەسێکی تۆمەتباری ئەم ساختەکارییەی بواری دەرمانیشیان قۆڵبەست کردوە. هەر لە 2013 دا کۆمپانیایەکی تری دەرمانسازیی لە چیندا ناسێنران ئەم کۆمپانیایە کاری ئەوە بوو کە دەرمانی ساختە و بەرهەمهێنراوی لە بریکارە

نایاساییيەکانی دەرمانسازیی دەکڕییەوە و لە بازاڕی ڕەشدا ساغی دەکردنەوە. ئەم کۆمپانیایە کاری ئەوە بوو بارهەڵگرەکانی خۆی ڕاسپاردبوو کە دەرمان بەشاراوەیی بنێرنە دەرەوە بە تایبەتی وابەستە بوو بە وڵاتی ئەردەنەوە، ئیتر لەوێوە تـەواوی ئـەو دەرمـانـە ساختە و کۆپیکراو و تەزویرانە لە خۆرهەڵاتی ناویندا بڵاو دەبوونەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ زۆرێک لە هەرێمەکان لە گۆڕەپانی جیهانیدا هێشتا ئەوە دژوارە کە دیاری بکەین ئایا ساختەکاری و قاچاخچێتیی دەرمان لە زیادبووندایە یان بەرەو کەمبوونەوە دەچێت، ئەم ئاڵۆزییەیش لە 2008ـەوە تا ئێستا هێشتا یەکلا نەبوەتەوە، بۆیە دژوارە ئەو بڕیارە بدرێت کە بە شێوەیەکی گشتی کاری دەرمانسازیی نایاسایی و قاچاخیی دەرمان لە جیهاندا لە برەودایە، بەڵام دەتوانین بڵێین لە چەند هەرێم و کیشوەرێکدا ئەم بوارە ڕوو لە زیادبوونە.

### 2. 2. ئاراستە نوێیەکانی ئەم دواییيە

زیادبوونی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت. ئاراستەی سـەرەکـی کە لە وەڵامـی ڕاپرسییەکانەوە بە

دەستمان گەییشتوە خۆی لەو ڕاستییەدا دەبینێتەوە کە لە ئێستادا ئەنتەرنێت ئامڕازێکی کاریگەرە بۆ ساغکردنەوە و فرۆشتنی دەرمانی نایاسایی و قاچاخ. تەنها لە یەک وڵاتی کیشوەری ئەورووپادا ئاماژەکان باس لەوە دەکەن کە تۆماری ماڵپەڕە نایاساییەکانی بواری دەرمان ڕوو لە کەمبوونەوەن، چونکە لەوێدا ڕێوشوێنی ئێجگار سەخت دژ بەو پرسە گیراوەتە بەر. لە ڕاستیدا ئەنتەرنێت ئامڕازێکی باشە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمە قاچاخەکان، چونکە ئەنتەرنێت بۆ کەسانی ساختەکار پەناگەیەکی ئاساییشیی باشە و هاوکات ناسنامەی کەسەکان و پێگە و شێوازی کاریان بە هۆی ڕێوشوێنی گونجاوەوە دەشارێتەوە. هەروەها ئەو قازانج و سوودەیش کە لە دەرمانگەیەکی ئۆنلاینی ئەنتەرنێتییەوە بە دەست دەکەوێت، فرە زۆرە و ئاسانتریش بۆ فرۆشیاران ساغ دەبێتەوە. لە یەک نێتۆرکی ئەمەریکیدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ، لە 2 ساڵیدا 55 ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بە دەست هاتوە. ئەوە تەنها لە دەستبەکاربوونی ئەو تۆڕەدا بۆ ئەو کارە نایاساییە. ئەم ڕەوشە

گەلێ بەربڵاوە لە ئەمەریکادا بە تایبەتی لە ویلایەتەکانی سنت کیتس و نویس و پاناما، هەر بۆیە چەندین ڕێوشوێن لەو بارەوە هەیە، هاوکات وابەستە بوون بە کاری سپیکردنەوەی پارە و فرۆشتنی تۆڕەکانی دەرمان لە ئەنتەرنێت و پەیوەستبوونیان بە بانکی تایبەتەوە. هەموو ئەوانە ئاستێکی پێشکەوتوویان لە بواری تاوانکاریدا بڕیوە. ئەم ڕێوشوێنە ئەنتەرنێتییە توانیویەتی تا ڕادەیەک شوێن بە گروپە تاوانکارە کلاسیکییەکان لێژ بکات کە بە شێوەیەکی هەرەمی ڕۆڵی کاری خۆیان لە سەرەوە بۆ خوارەوە دابەش کردبوو.

### هەژمووونی دەرمانی نایاساییی پەیوەست بە لاوازیی سێکسی

یەکێکی تر لە وەڵامی ڕاپرسییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی جەختکردنەوە بوو لە هەژموون یان زیادبوونی بازرگانیکردن بە دەرمانەوە. ئەمەیش سەرنجی تەواوی کەناڵە گومرکییەکانی بۆ خۆی ڕاکێشاوە. زۆرترینی ئەو دەرمانانەیش بریتین لەوانەی کە لە

ڕێگای ئۆنلاینەوە کڕینوفرۆشیان پێ دەکرێت. زۆرترینی ئەو کەناڵانەی کە ئەم بازرگانییەیان تێدا دەستەبەر بوە، خۆی دەبینێتەوە لەو دەرمانانەی کە پەیوەستن بە دەرمانی لاوازیی سێکسی و بە شێوەی نایاسایی کاری بازرگانییان پێ دەکرێت. بوارێکی تری دەرمان کە لە دوای دەرمانی لاوازیی سێکسیی دێت بریتییە لە دەرمانی فیتنس و لەشجوانی و ئەو دەرمانانەی کە پەیوەستن بە ژیان تەندروستەوە، هەروەها دەرمانی تری پەیوەست بە کاری نایاسایی و قاچاخ جگە لە بواری سێکس و تەندروستی و لەشجوانی بریتییە لە دەرمانە گرانبەهاکانی پەیوەست بە نەخۆشیی ئایدز و نەخۆشیی شێرپەنجەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش زۆرترینی دەرمانی فرۆشراوی نایاسایی خۆی لەو کایە و بوارانەی نەخۆشیدا دەبینێتەوە.

### بڵاوبوونەوەی دەرمانی وزەبەخش

ساختەچێتیی بواری دەرمانی وزەبەخش یەکێکە لەو بوارانەی کە قازانجێکی ڕادەبەدەر و کڕیارێکی فرەی هەیە و گروپە یاساغ و

مافیاکانی دەرمانیش زۆرترین دەستی بۆ دەبەن بە تایبەتی لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا. لە وەڵامی ڕاپرسییەکانەوە سێ گرووپی گچکەی نێونەتەوەیی ناویان هێنراوە کە پەیوەستن بە دەرمانی ساختەی وزەبەخشەوە و شوێنی چالاکییشیان بریتییە لە ئەورووپای خۆرهەڵات. ئەوان دەتوانن بەرهەمەکانیان ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ئۆنلاین و ئەنتەرنێتەوە ساغ بکەنەوە یان ڕاستەوخۆ لە یانەکانی شەوانە و یانە وەرزشی و لەشجوانییەکاندا ساغی دەکەنەوە. یەکێک لە وەڵامی ڕاپرسییەکان بەئاشکرا گرووپێکی بچوکی نێونەتەوەیی دیاری دەکات کە کاری بازرگانی و قاچاخی بە دەرمانی وەزەبەخش دەکات لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا. ئەوە زانراوە کە لە هەماهەنگی لەتەک گرووپێکی تاوانکاردا لە دوو وڵاتی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا کەرەستەی خاوی ئەو دەرمانە وزەبەخشانە دەفرۆشرێت بە ئاسیا و لەوێیش دەرمانی نایاسایی وزەبەخشی لێ بەردەهەم دەهێنن. لەوێیشەوە ئەم دەرمانە بەرهەم هێنراوانەی وزەبەخش دەفرۆشرێتەوە بە ئەورووپای خۆرهەڵات و وڵاتانی تریش.

هەروەها ئیسرائیل لەم بارەیەوە ئەوەی خستوەتە ڕوە کە چۆن مافیاکانی دەرمان، هەڵدەستن بە قاچاخچێتیی دەرمانی وزەبەخش و دەینێرن بۆ لوبنان. هەر بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی ئیرائیلی دوو بۆ سێ ڕێکخراوی نایاسایی و تاوانکار لە ئیسرائیلدا هەن، بەڵام تاقیگەکانی ئەم ڕێکخراوانە لە ئەمەریکادان. لە ڕاستیدا تۆڕێکی هەواڵگیریی چالاک هەیە کە کار لە سەر کرێکاری بیانی و گەشیارەکان دەکات، کاری ئەوان لە ماڵدیفەوەیە، ئەوان لە ڕێگەی ئەوانەوە قاچاخچێتی برەو پێ دەدەن و دەینێرنە دەرەوە و زیاتریش ئیش لە سەر مادە و دەرمانی وزەبەخش بە تایبەتی جۆری ئانابۆلیک دەکەنەوە.

**دەرمانی نایاسایی و مادەی هۆشبەر**

بەشێک لە ڕاپرسییەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەفیون هاوردە دەکرێت و بە شێوەی نایاسایی دیسانەوە بەرهەم دەهێنرێت و مادەی هۆشبەری لێ بەرهەم دەهێنن. یەکێک لە سەرچاوە بەردەستەکان جەخت لەوە دەکاتەوە چۆن مەوادی ئەفیونی فرە بە خراپی لە بەرهەمە

نایاسایی و قاچاخەکانی دەرماندا بە کار دەهێنرێت.
لە ئەمەریکادا دەرمانێکی ناسراو بە ئوکسیودون و هیدروکودون لە دەرمانخانەکانەوە دەدزرێت یان بە دەست دەهێنرێت، ئەم دەرمانە بە شێوەیەکی تر بە بێ هیچ ڕەچەتەیەکی پزیشکی دەفرۆشرێت و بەر دەست دەکەوێت. زانیارییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مافیاکان و گروپەکانی تاوان بازرگانی و قاچاخییەکی بەرفراوان بەم جۆرە دەرمانانەوە دەکەن. لە دامەزراوەیەکی بەرچاوی ئەمەریکادا سەرنجی تـەواو خـراوەتـە سـەر ڕێکخراوێکی یاساغ و تاوانکاریی بـواری دەرمـان کە چۆن قاچاخچێتی دەکات بە مادەکانی وەک فایکودین، ئۆکسیکۆنتین، خاناکس، کۆدین و پێرکۆسید24.
لـەم سـاڵانەی دواییـدا ئـەوە خرایە ڕوو کە لە ئەمریکادا و بە تایبەتی لە سیاتڵن گروپێکی پەیوەست بە قاچاخچێتیی کسیکودون دەستی بە سەردا گیراوە و بە تەواوی لە نێو براون25.

## پێوەندیی تۆکمە بە تیرۆرەوە

ڕێکخراوە تاوانکار و مافیا نێونەتەوەییەکان هاوشێوەی کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان وەهان،

لە وڵاتێکدا ڕێکخراوگەلێکی یاساغ و تاوانکاریی دەرمان هەن کە تەنها بەرپرسن لە بەرهەمهێنانی دەرمانی یاساغی پزیشکی، لە هەمان کاتدا وڵاتگەلی تر هەن کە ئەو ڕێکخراوە تاوانکارانە تێیدا تەنها بەرپرسن لە ساغکردنەوە و دابەشکردنی دەرمانی پزیشکیی نایاسایی. لەم میانەدا ڕێکخراوە هەمەجۆرەکان بۆ ئەوەی سودی هاوبەش و تەواوکەریی کاری یەکتریی بن دەست دەدەنە کاری هاوبەش و هەماهەنگیی یەکتری. بۆ نموونە لە ئەفریقای خۆرهەڵات پیشەسازیی ساختە بە شێوەیەکی سەرەکی لە هیندستان و چینەوە سەرچاوە دەگرێت. لە ڕاپۆرتێکدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە پێوەندیی لە نێوان ڕێکخراوەکانی بواری دەرمان و ڕێکخراوی تیرۆریستی ئەلشەباب دروست بوە. لەوێدا ڕوون کراوەتەوە کە جۆرێک لە بەرژەوەندی و هەماهەنگی و قازانجی دوو لایەنە لە ئەتواری هەر دوو لادا هەیە و ئەو قازانجە هاوبەشە هەر دوو لای هێناوەتە سەر هێڵێکی پێوەندیی بەردەوام. لەگەڵ ئەوەیشدا

هێشتادا بەڵگەی یەکلاکەرەوە لە بەر دەستدا نییە کە بیسەلمێنێت ئەو گروپە مافیا و باندە گەورانەی بواری دەرمانی پپزیشکی، پێوەندییان ڕاستەوخۆ و بەردەوامیان لەتەک تیرۆریزمدا هەیە.

## زیادبوونی قاچاخچێتیی ترامادۆڵ

لە ساڵی ڕابردوودا ئەنتەرپوڵ هۆشداریی ئەوەی دا کە بە شێوەیەکی کتوپڕو و لەناکاو بازرگانی و قاچاخچێتیی هێنانی ترامادۆڵ بۆ ئەفریقای خۆرئاوا ئێجگار زۆر بوە. ترامادۆڵ جۆرێک لە ئەفیونە و لە بواری هێوری و ڕەوشی تەرفیهی مرۆڤدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت، ئەم مادەیە مادەیەکە مرۆڤ پێوەی ئالوودە دەبێت، لە ساڵانی ڕابردوودا بە شێوەیەکی گشتی کیشوەری ئەفریقا و بە تایبەتی بەشی خۆرئاوای ئەو کیشوەرەی گرتوەتەوە. وەختە بە تەواوی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بوونی خۆی دەکاتە دیاردەیەکی ئێجگار ئاسایی. زانیارییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە چۆن بە شێوەیەکی قاچاخ ئەم حەبی ترامادۆڵە دزە دەکاتە نێو ئیماراتی

عەرەبییەوە، تەنها لە 2012 دا لە بەندەری عەلی دا زیاد لە 91 ملیۆن یەکەی ئەم ترامادۆڵە دەستی بە سەردا گیراوە. لە میانی ئەو هەڵمەتی دەستبەسەراگرتنەدا توانرا دە کەس دەستگیر بکرێت کە دەستیان لە بڵاوبوونەوە و کاری قاچاخچێتیی ئەم حەبەدا هەبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا تا ئێستا ئەوە ساغ نەبوەتەوە کە چ ڕێکخراوێکی یاساغی دەرمان دەستی لەم ئالوودەبوونەی ناوچەکەدا هەیە بە ترامادۆڵ و بەو دۆسیەیەی کە لە ئیماراتی عەرەبیدا هەیە. ڕاستە چەندین ئاڕاستە هەن یان چەند سەرەداوێک هەن بۆ زانینی سەرچاوەکانی ئەم کارەساتە، بەڵام هێشتا بەوردی و بە سەرنجەوە نازانرێت ئەم شەپۆلە بەرپرسی یەکەم تێیدا کێیە و چۆنە.

### 2. 3. پێکهاتە و شێوازی کار

#### 2. 3. 1. پێکهاتەی هەرەمی کلاسیکی

وەڵامی ژمارەیەکی کەمی ڕاپرسییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بە شێوەیەکی کلاسیکیی ئەو گروپە تاوانکارانەی کە تێوە گلاون لە کاری دەرمانی یاساغ و قاچاخی

دەرماندا پێکهاتەیان ئێجگار کەمن. بە جۆرێک لە نێوان دوو بۆ 10 ئەندامدان. هەر سێ گروپ لەوانە خاوەنی یەک بەرپرس و سەرکردەن. ئەوانە هەندێک کات لە لایەن جێگرەکانیانەوە پشتیوانی و هاوکاریی دەکرێن. ئەندامەکانی تری ئەم گروپانە هەر یەکەیان خاوەنی ڕۆڵێکی دیاریکراوە لە ناو گروپەکەدان بۆ نموونە هەر یەکە لەوانە تایبەت کراوە بە دزینی دەرمانن ساختەکردنی دەرمان و لەپاکەتنان و ڕێکخستن و دانانی مێژووی دروستبوون و بەسەرچوونی دەرمان. ئەم گروپانە هەندێک کات ئەندامەکانیان پەیوەست دەکرێن بە ساغکردنەوە و فرۆشتنی دەرمانی نایاسایی و ساختە لە بازاڕی ڕەشدان، زۆر جاریش ڕاستەوخۆ دەرمانە ساختە و دزراوەکان دەدەنە کۆگاکانی دەرمان و دەرمانخانەکان یان بازرگانیی پێ دەکەن. هەندێک کاتیش شوێن و کاتی فرۆشتن و وەرزی فرۆشتنیان دیاری کراون، بەشێکیان تەنها لە شوێنە تایبەتەکاندا دەرمانەکان دەفرۆشن، بۆ نموونە دەرمانە وزەبەخشەکان دەبەنە یانەکانی شەوانە و یاریگا و یانە

وەرزشییەکان و لەوێدا بەنهێنی و بە نایاسایی ساغی دەکەنەوە. ئەم ڕێوشوێنە زۆر جار لەگەڵ ئەوەی کە دەرمانی ساختە دەفرۆشن، کڕیارانیشی پێ فریو دەدەن، چونکە بە نووسینی ئاڵۆز و نووسینی ساختەی سەر پاکەتی دەرمانەکە دەتوانن لە شوێنەکاندا کڕیاران فریو بدەن و قازانجی زیادتر بکەن، لە بەریتانیادا لە کۆتایی 2011 دا تۆڕێکی لەو جۆرە دەستگیر کران کە دەرمانی لاوازیی سێکسییان دەفرۆشت و لە کاتیکدا ئەو دەرمانە شتێکی تر بوو. ئەو تۆڕە کە دەستگیر کرا بنکەکەی لە بەریتانیادا بوو. لە دوایین ڕاپۆرتی ئینتەرپۆڵدا ئاماژە بە ترسناکیی زانیاریگەلێک دەکرێت کە پەیوەستە بە کاری ڕێکخراوە تاوانکارەکان و دەستێکەڵکردنیان لەگەڵ خەڵکی تاوانکار و لە شوێنە گشتی و پێچوپەناکاندا ئەم بوارەیان زیاد پەرە پێ داوە. هەر لەم بارەیەوە زانیاریی دەزگا هەواڵگرییەکان بە جۆرێکە کە ڕادەی گرووپە تاوانکارەکان و چالاکییان لە بواری دەرماندا زیاد لە پێشبینیی ئاماژە پێ دەکات، تەنانەت شوێنی تایبەتی ساغکردنەوەی ئەو

دەرمـانـانـە و ئاڵۆزیی تۆڕەکانی پێوەندییان پێشـچاو دەخات. هەروەها باس لەوە دەکات کە هێشتا بـازاڕی ڕەش کۆنـترۆڵ نـەکـراوە و بەردەوام کەسانی ئالوودە بە دەرمان و کەسانی هەژار و کەم ڕۆشنبیر نێچیری باشی ئەم گرووپە تاوانکار و مافیایانەی بـواری دەرمـانـن. ئەم گرووپە تاوانکارانەی کە پەیوەستن بە مادەی هۆشبەرەوە ڕێوشوێنی توندیان لە بەرانبەردا دەگیرێتە بەر، بەڵام گرووپەکانی دەرمانی ساختە لەم میانەدا پێیان باشە درێژە بە کارەکەیان بدەن و بە قازانجێکی کەم دابکەون و خۆیان تـووشـی گـێـچـەڵـی یـاسـا نـەکـەن، وەک ئـەو گـرووپـانـەی کـە وابـەسـتـەن تەنها بـە مـەوادی هۆشبەری وەک کۆکایین و هیرۆیینەوە، چونکە بەراورد کراوە کە کۆمپانیاکانی دەرمانی ساختە کەمتر لە پێش چاو گیراون لە چاو ئەوانەی کە قاچاخچێتیی هێرۆیین و مادەی هۆشبەر دەکەن. بـە گـوێـرەی زانیارییەکانی ئینتەرپۆڵ ئـەوە خراوەتە ڕوو، کە ئەو ڕێکخراوانەی کە کاری قاچاخیی مـادەی هۆشبەر دەکـەن و دەتوانن مادەی دەستکردی هۆشبەر بەرهەم بهێنن، هەر

ئەوان بەسانایی دەتوانن دەرمانی یاساغ و ساختەی پزیشکی دروست بکەن. زانیارییەکانی ئینتەرپوڵ لە ئەورووپا و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا لەو بارەوە سەرنجی خۆیان خستوەتە ڕوو، کە ڕێکخراوە تاوانکارەکان لە ئێستادا دەزگای تایبەت بە دروستکردنی دەرمان و حەبی پزیشکییان لە بەر دەستدایە و بە شێوەیەکی پێشکەوتوو دەتوانن ئەو دەرمانانە بنێرنە نێو بازاڕەکانەوە33. دەرمانی ساختە لە کۆی کیشوەرەکاندا بوونی هەیە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ڕایەڵەکانی پێوەندی و لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ئامێرەکانی دروستبوونی دەرمان و لەگەڵ زیادبوونی پسپۆڕی و بەربڵاوی زانست، لە ئێستادا زۆرێک لە وڵاتانی دونیا گرفتاری ئەم ڕێوشوێنەن. هەر بۆیە تەنگژەی سیاسی و ناهەمواری بارودۆخی سیاسی و جەنگە ناوخۆییەکان لە گەلێ لە کیشوەرەکاندا دیسانەوە زەمینەیەکی لە بارن بۆ درێژەدان بەم کارە یاساغانە، لە هەر وڵاتێک دەسەڵاتی سیاسیی لاواز بوون لە هەر وڵاتێک کەرتی تایبەت ڕۆڵی زیاتری لە میری و

دەوڵەتدارێتیدا بینی، لە هەر وڵاتێک ئاژاوە و ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و سیاسی بوونی نەبوو، ئەو ڕێوشوێنەی قاچاخی تێیدا برەوی هەیە، ئەو کاری دەرمانسازییەی کە هەیە زیاتر وابەستەیە بە هەلومەرجی سیاسیی وڵاتەوە. هەروەها بەشێکیشی وابەستەیە بە ناهەمواری ڕەوشـــی ئـابـووری و لاوازیـــی ژێرخـانـی ئـابـوورییـەوە، ئـەم بـارودۆخـە ناجێگیرەی ئابووری و سیاسی و نەبوونی یاسا لە گەلێ لە وڵاتەکاندا ژینگەیەکی لە بارە بۆ هەڵتۆقینی گروپە تاوانکارەکان. دیوی ئەم کارە یاساغانە خۆی دەبینێتەوە لە دوو ڕەهەند کە وڵاتانی پێشکەوتوو لەگەڵ وڵاتانی دواکەوتوو گرفتار تێیدا بەشدارن. وڵاتانی دواکەوتوو پاڵنەری ئەو وڵاتـانـەن کـە خەڵکی پسپۆڕ و کـاراکتـەری پێشکەتوو و لادەر لە یاسایان هەیە، لەوێدا کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان دەتوانن کارەکانی خۆیان ساغ بکەنەوە، چونکە هەژاری و نەداری و بێ فەرهەنگی خەڵک ئاتاجیان بەو دەرمانانە زیدا دەکات، یان ئەو وڵاتانە دەبنە ژینگەیەکی لە بار بۆ ساغکردنەوەی دەرمانی هاوردەی قاچاخ.

له هەمان کاتیشدا دیویکی تریش لەوەدا ئەوەیە کە لاوازیــی یاسا و گەندەڵی لـە هەندێک لە وڵاتاندا وا دەکات کە بەشیک لە دامەزراوەکانی میریی کارئاسانی بۆ ئەم شێوازی قاچاخییە بکەن، هەر بۆیە زیاتر و زیاتر برەو بەو کارە دەدەن و نـاوچـەکە دەبێتـە مـەیدانـی گروپە تاوانکار و یاساغەکانی دەرمان. هەروەها تا لە وڵاتێکدا ئەم قاچاخچێتییە بەردەوام بێت، زیاتر کۆمەڵ ئالوودەی ئەم دەرمانانە دەبێت، چونکە دەرهاویشتەی ئەو دەرمانە پزیشکییانەیە کە کۆمەڵێکی ناساغ و ناسەلامەت دێتە پێشەوە، هەمیشە کۆمەڵی نەخۆشیش ئاتاجی بە دەرمان و پێویستییە تەندروستییەکانە. هەر بۆیە تەواوی پاڵنەرەکان لە ئەمڕۆدا بە تایبەتی لەم دە ساڵەی دواییدا سەرنجی تەواوی دەزگا هەواڵگیری و توێژینەوە ئەکادیمییەکانی ڕاکێشاوە کە بوونێکی گەورەی دەرمانی ساختە و لایەنێکی گەورەی ئەو بـوارە هەڕەشە لە داهاتووی مرۆڤایەتی دەکات. لەم میانەدا دەرمانی یاساغ خراپترین جـۆری ئـەو کارانـەیە کـە قاچاخچێتیی پێوە دەکرێت. چونکە لە سەرەوە ئەوەمان زانی کە

چۆن مادەی هۆشبەر سەرنجی فرە و چاودێریی فرەی لە سەرە و بژاردەیەکیش لە ڕەوشێکی تایبەتدا پەنای بۆ دەبات، بەڵام دەرمانی ساختە شتێکی گشتییە و بەسانایی دەخزێتە جەستەی نەخۆشەوە و پەیوەست نییە بە تەمەن و کاتێکی دیاریکراوەوە، یاخود ئاڵتوونی قاچاخ و بازرگانیی مرۆڤ و نەوتی قاچاخ و سەرلەبەری ئەو شتانەی کە یاساغ و نایاسایین هیچ کام لەوانە هێندەی دەرمانی پزیشکی نابێتە هۆکارێکی نەرێنیی گشتی و کۆمەڵ بگرێتەوە. لەبەر ئەوە زۆرترینی سەرنجەکان لە سەر مەترسییەکانی بازرگانیکردنن بە دەرمانەوە. لە ئێستادا هەر یەک لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین بە جۆرێک لە جۆرەکان گرفتاری دەرمانی یاساغ و ساختەن. ئەوان لە دەرهاویشتەدا زیانێکی زۆر دەچێتە نێو تەندروستیی کۆمەڵگەکەیانەوە، لە هەمان کاتدا کۆمپانیا زەبەلاحە نێونەتەوەییەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا و خۆرهەڵاتی دوور گرینگی بەم بوارە دەدەن و بژاردەیەکی کەم لەو دیوە شێوە سەرمایەدارییەدا کەڵک لە داهاتێکی زۆری

دەرمـان دەبینن. خاڵێکی تر ئێجگار گرینگ و مەترسیدار لە بواری بازرگانیی دەرماندا بریتییە لە بیرکردنەوە لە خواستی قازانجی زۆر بە شێوەیەک مەترسیی دەرمان تەنها و تەنها لە ڕێکخراوە نایاسایی و مافیاکانەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکوو زانیاریی مەترسیدار زۆر جار لە دامەزراوەکانی دەرمانەوە لەو ناوەندانەوە سـەرچـاوە دەگـرێـت کـە نـاوەنـدی فـەڕمـی و زانستین، بـەڵام سەرچاوەکانی قازانجی ئەو کەرتە تایبەتانەی بواری بەرهەمی دەرمان هەر چەند کە یاسایین، زۆر مەترسیدارترن، چونکە بیرکردنەوە لە قازانج لە دەرەوەی خواستە هیومانیستییەکانە، زۆر جار لە پێناو ڕەواجی جۆرێکی تایبەتی دەرمان، ڕێ لە بڵاوبوونەوەی دەرمانێکی چارەسەری دەگیررێت، ئەم دیاردەیە لە چەندین دۆسیە و توێژینەوەی دیاریکراودا ئاماژەی پێ کـراوە، کۆمپانیاکانی دەرمـان بە تایبەت لە بواری نەخۆشییە درێژخایەنەکاندا خاوەنی قازانجێکی ئێجگار فرەن، ئەم ڕەوشە وای کـردوە داهـێـنـانـی بـواری چـارەسـەریـی یەکجاری یان بایەخی پێ نـادەن، یاخود هەر

داهێنانێکی بنبڕ لە نێو دەبەن و ڕێ لە بڵاوبوونەوەی دەگرن. ئەم دیاردەیە بە بەڵگەی تەواو یەکلا نەکراوەتەوە، بەڵام لە ململانێی جەمسەرەکاندا بە تایبەت وڵاتانی نەیاری ئەمەریکا، یان لە چەندین دۆسیەی شاراوەی نێوان ڕووسیا و ئەمریکا، یان چین و ئەمەریکا ئەوە خراوەتە ڕوو، کە حاڵەتی لەو جۆرە تۆمار کراوە. لەبەر ئەوە دیوێکی ترسناکی کۆمپانیاکانی دەرمان تەنها لە کۆمپانیا نایاساییەکان یان گروپە تاوانکارەکاندا نییە، بەڵکوو وابەستەیە بە کۆمپانیا فەرمی و دامەزراوە زانکۆیی و ئەکادیمییەکانەوە34. لێرەوە سەرەتای پرسێکی نوێ دێتە ناو پرۆسەی بەرهەمهێنانی دەرمان و بازرگانیی دەرمانەوە کە بریتییە لە پرسی قازانج و بواری سەرمایەداری، ئەمەیش بەسانایی لە هەر ڕاپۆرتێکی ئەنتەرپولدا کە لەم توێژینەوەیەدا ئاماژەی پێ کراوە دەخوێنرێتەوە35. لایەنێکی تری قاچاخی دەرمان وابەستەیە بە نەزمێکی سیاسییەوە، ململانێ سیاسییەکانی نێوان وڵاتان بە جۆرێکە پەنا دەبەنە بەر چاندنی مردنی هێواش دژ بە

یەکترین، ئەم ڕەوشە لە سیاسەتی دونیای سەرمایەداری و وڵاتانی سەردەستدا فرە لەپێشچاو گیراوە، نموونەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە ڤێتنام و کۆریادا هەیە، بە تایبەتی لەو کاتەی خۆرئاوا و ئەمریکا ڕووبەڕووی ئەو کێشەوەرانە ببوونەوە لە نیمچەدوورگەی هیندی چینیدا، چونکە تەواوی ئەو دەرمانانەی کە بە جۆرێک لە جۆرەکان دزەیان دەکردە ئەوێوە، کۆمەڵێکی ناتەندروست و گرفتاری نەخۆشییان هێنایە پێش، کە بە گوێرەی ڕاپۆرتەکانی ڤێتنام هێشتا شوێنەواری ئەو دەرمانانە لە ناو جەستەی کۆمەڵی ڤێتنامیدایە. هەروەها هەمان دیاردە لە ململانێی وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ئەمریکا بە تایبەتی لە گەرمەی جەنگی ساردا تێبینی دەکرا، ئەوانیش لە ئاتاجیاندا بە دەرمانی خۆرئاوا و ئەمەریکا دووچاری دەردی کوشندەی کۆمپانیا ساختەکانی دەرمان بوون. دیوێکی تری خواستی قازانج ویستی لە دەرماندا سەر دەکێشێت بۆ پرسێکی نائینسانی دژی ئەو پرسەیش لە گەلێ لە سەرچاوە ئەکادیمییەکانەوە

ئـامـاژەی بـۆ کـراوە، بـە تایبەتی لـە جەنگی ناوخۆیی و سیاسەتی زلهێزان لە ململانێ لە وڵاتـە دواکـەوتـوەکـانـدا، بـە تایبەتی جەنگی درێژخایەنی زۆرێـک لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، هەندێک سەرچاوە پێیان وایە کە جەنگەکان بەشێکیان سیاسەتی کۆمپانیاکانی دەرمـان و بازرگانە گەورەکانی دەرمـانـی لە پشتەوەیە، چونکە لەو وڵاتەدا کە شەڕوشۆڕ و ژینـگـەی نـاتـەنـدروسـت هەبێت کۆمپانیاکان زەمینەیەکی لـە بـاریـان بـۆ دەرەخـسـێـت بۆ قازانجێکی زۆروزەبەند لەو بوارەدا، بە گوێرەی ڕاپـۆرتـێـکـی نهێنی ئـامـاژە بـەوە کـراوە کە جەنگەکانی عێراق و سووریا و ئەڤغانستان بە شـێـوەیـەک لـە شـێـوەکـان درێـژبـوونـەوەیـان پاڵنەرێکی بریتییە لە سیاسەتی مافیا گەورەکانی بواری دەرمـان و بازرگانیی دەرمانن، چونکە ئـەوان لـەو میانەدا بوونە خـاوەنـی قـازانـج و سەرمایەکی زۆر و تا ژینگەکە داڕوخاوتر بێت، ئـەوان قازانجێکی زیـاتـریـان لـەو ژینگەیەدا دەستگیر دەبێت و برەوی زیاتر بە کارەکانیان دەدەن.

## چالاکییە ئیقلیمەکان لە بواری بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە

لاوازیی دەستەکانی ڕێکخستنی دەرمان و بڵاوبوونەوەی دەرمانی نایاسایی لە ژمارەیەکی زۆری وڵاتانی ئەفریقا بە تایبەتی، بە یەکێک لە ئالینگارییە هەر گەورەکان هەژمار دەکرێت، بۆیە چەندین کۆبوونەوە لە بارەی بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە ئەنجام دراون و تێیدا نوێنەرانی چەندین وڵات و فەرمانبەرانی گومرگ و و کارمەندانی تەندروستی لە نزیکەی 13 وڵات ئامادەی بوون. پێشنیار کرا پشتیوانی لەو

وڵاتـانـه بكرێت، كه كێشـەی هـەره گـەورەیـان بریتییه له پڕكردنەوەی پێویستیی دەرمـان و كـەرەسـتـەی پزیشكی. هـەروەهـا ئەنجامدانی لێكۆڵینەوەی چڕوپڕ بۆ دیاریكردنی قەبارەی كێشـەكـه و دانـانـی سـتـراتـیـژیـەتـی نـوێ بۆ زانیاری و هۆشیاركردنەوه و پێوەندیی كرد سەبارەت به مەترسییەكانی بەرهەمه پزیشكییه ساختەكارەكان بۆ سەر كارمەندانی تەندروستی و سەرجەمی خەڵكیش به شێوەیەكی گشتی. دانانی تیمی كاری نێودەوڵەتی پێوەندیدار به بەرەنگاربوونەوەی ساختەكاریی دەرمان.

ڕێكخراوی نێودەوڵەتی بۆ پۆلیسی تاوانكاری و ڕێكخراوی تەندروستیی جیهانی كۆنگرەیەكی ئیقلیمی سـاز كـرد و دوو ڕۆژی خایاند بۆ تـاوتـوێـكـردنـی پـرسـی بـەرەنـگـاربـوونـەوەی بەرهەمه پزیشكی و دەرمـانـه ساختەكان له (جوهانسبۆرگ، باشووری ئەفریقا ـ له 9 و 10 تشرینی دوەمی ساڵی 2015) و تێیدا نزیكەی نوێنەری 15 وڵات ئامادەی بوون له دەسەڵاتی نیشتیمانی بـۆ ڕێـكـخـسـتـنـەوەی دەرمـــان و دەسەڵاتی پۆلیس و گومرەكان. دۆخی دەرمانی

ساختەیان لە باشووری ئەفریقا خستە ڕوو، بە تایبەتیش وڵاتانی ئەندام لە کۆمەڵەی گەشەپێدانی باشووری ئەفریقا. بەشداربوان کۆک بوون لە سەر دانانی چوارچێوەیەکی یاسایی گونجاو و بەستنەوەی بە تیمی کارکردنی نێودەوڵەتی، هەروەها فراوانکردنی چالاکییە هاوبەشەکان بۆ جێبەجێکردنی یاسا.

لە چوارچێوەی تۆڕی وڵاتانی ئەمەریکایش، ئەوانە پێوەندیدار بوون بە خۆگونجاندن لە نێوان لیستی ڕێکخستنی دەرمان، کە لە ساڵی 1999ـوە دامەزراوە، تیمی کارکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختەیان پێکهێنا. لێکۆڵینەوەیەکی وردیش کرا لە سەر دۆخی ساختەکردنی دەرمان لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی و ویلایەتە یەککگرتوەکان. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەیە دەرکەوت، کە ڕادەی توندیی ئەو کێشەیە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازییان هەیە. دواتر بە مەبەستی تیشک خستنە سەر قەبارەی کێشەکە، تیمی کارەکە نەخشەڕێگایەکیان دیاری کرد بۆ چۆنێتیی بەکارهێنانی لە هەڵسەنگاندنی قۆناغەکانی

جێبەجێکردنی بەرنامەکەیان، کە لە لایەن هەر وڵاتێکی پێوەندیدار بەو مەسەلەیەوە دەگیرێتە بەر، هەروەها بۆ جێبەجێکردنی چالاکییەکانی قەدەغەکردن و ڕێگەگرتن لە ساختەکردنی دەرمان لە چوارچێوەی چالاکیی دەسەڵاتە تەندروستییە نیشتیمانییەکەی پێی دراوە.

دوا بە دوای ئەویش ئۆفیسی ئیقلیمیی ئەمەریکای لاتینی و ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا بەیاننامەیەکیان دەرکرد لە سەر ڕێگەگرتن و بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە لە وڵاتانی دەریای کاریبی. تیمی کاریش پەیوەست بە بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە، سەر بە تۆڕی وڵاتانی ئەمەریکا.

ئۆفیسی ئیقلیمی بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پشتیوانی لە وڵاتانی ئەندام لە ئیقلیم دەکا بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانی نیشتیمانی بۆ ڕێکخستنەوەی دەرمان و بنیاتنانی توانای تاقیگە نیشتیمانییەکان بۆ چاودێریکردنی جۆرێتیی دەرمان، هەروەها هاندانی دەسەڵاتداران بۆ ڕێکخستنەوەی دەرمان بۆ بەشداریکردنیان لە کۆبوونەوە کارەکانی تیمی کاری

نێودەوڵەتیی پەیوەست بە بەرەنگاربوونەوەی ساختەکردنی دەرمان و کەرەستەی پزیشکی و ئاگادارکردنەوەی دەسەڵاتدارانی ڕێکخستنی دەرمـــان بـۆ ئــەو ڕاســـپـاردە و ئـەنـجـامـی کۆبوونەوەکانی تیمی کار.

لە ئیقلیمی ئەورووپیش: ئۆفیسی ئیقلیمی کار دەکات لەگەڵ دەسـەڵاتـدارانـی ڕێکخستن لـە وڵاتـانـی ئـەنـدام لـە کـارکـردن لـە سـەر بـەرەنـگـاربـوونـەوەی دەرمـانـی سـاختـە. بە شێوەیەکی تایبەتییش پشتیوانیی خـۆی بۆ وڵاتـانـی بـاشـووری خۆرهەڵاتی ئـەورووپـا و وڵاتانی تازەپێگەییشتوو، لەوانەیش ئەرمینیا و ئازەربیجان و بیلاروس و، کازاخستان و قیرغستان و کۆماری کۆلدووۆفیا و ئۆکرانیا دەکات. ئۆفیسی ئیقلیمی لە نزیکەوە بەدواداچوون بۆ ئەو هەوڵانە دەکات کە ئەنجوومەنی ئەورووپا لە ئامادەکارییەکانی بۆ ڕێکەوتنی نێودەوڵەتی دەیاندات بۆ بەرەنگاربوونەوەی ساختەکاری. لە کاتی ئێستایشدا، گفتوگۆ دەکرێت لە سەر ڕێکەوتن لە سـەر دانـانـی چوارچێوەیەک بۆ ئەنجوومەنی وزاریی سەر بە ئەنجوومەنەکە.

پێشبینیش دەکرێت بگەن ڕێکەوتنێک لە بارەی ئەو پرسە. بەم ڕێکەوتنە توانای یاسایی بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوانەکانی ساختەکردن زیاتر دەبن. لە هەمان کاتیشدا هەر یەک لە کۆمسیۆنی ئەورووپی و وڵاتانی ئەندام لە یەکێتیی ئەورووپا گفتوگۆ دەکەن لە سەر دانانی تەشریعاتی نوێ دەربارەی دەرمانی ساختە.

ئیقلیمی باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا: لیژنەی ئیقلیمی لە ساڵی 2014 پرسی بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختەیان تاوتوێ کرد. وڵاتانی ئەندام جەختیان لە سەر گرینگیی وردبوونەوە لە کەرتی تەندروستیی گشتیی کردەوە لە سەر بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە، لەگەڵ دڵنیا بوون لە سەر پاراستن و کارایی هەموو جۆرەکانی دەرمان و جیاکردنەوەی لە پرسەکانی تری پەیوەستن بە مافەکانی خاوەندارێتیی فیکری. هەر لەوێدا چەندین وڵات نیگەرانیی خۆیان دەربڕی لە سەر دەستبەسەرداگرتنی ژمارەیەکی زۆر لە عەمباری دەرمان، کە بە نیازبوون بۆ وڵاتانی تازە دروست بوو ڕەوانە بکرێن بە ڕێگەی وڵاتانی ترەوە.

له ئیقلیمی خۆرئاوای زەریای هێمنیش:
دەیان ساڵە پشتیوانیی تەکنیکی بۆ چالاکییەکانی وڵاتانی ئەندام و بە تایبەتییش هەر وڵاتە و بە پێی تایبەمەندیی خۆیەوە پێشکەشی کراوە. ئەو چالاکییانەیش بریتی بوون لە: ڕێکخستنی بازنەی کار دەربارەی بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە لە هەر یەک لە (کەمبۆدیا 2001، تایلەند2002 ڤێتنام 2003، فلیپین 2005)، هەروەها مەشقکردن لە سەر ئاستی نیشتیمانی بۆ باشترکردنی توانای پشکنین و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە وردوچڕ.

له ساڵی 2004یشەوە سیستەمێکی ئیقلیمی دانرا بۆ هۆشیارکردنەوەی خێرا، بۆ ئەوەی ببێتە میکانیزمێک بۆ هۆشیارکردنەوەی پێشوەختە و ئەو وڵاتانە بگرێتەوە. کە هاوبەشن لە ئیقلیمی خۆرئاوای زەریای هێمن و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا. ڕێکخراوەکە لەگەڵ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ پۆلیسی تاوانکاری و هاوبەشەکانی تر لە بواری لێکۆڵینەوە لە دابەشکردنی دەرمانی ئەرتیسوناتی لاساییکەرەوە لە ناوچەی میکونگی

گەورە کار دەکات، لە چوارچێوەی پرۆسەی جۆپیتەر. لە مانیلایش بەرنامەی ڕاوێژکردن بە شارەزایان ساز کرا بە مەبەستی بەهێزکردنی سیستەمی چاودێریکردن و هۆشیارکردنەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەرمانی ساختە لە شوباتی 2010. هەروەها هەر دوو پرۆسەی (STORM) لە 2008 و پرۆسەی (STORM II) لە 2009 دا.

**ناساندنی زانستی بۆ دەرمانی ساختە**

- واتە ئەو دەرمانەی کە پێکهاتە شێوازی دروستکردنی لەگەڵ تایبەتمەندییە پێوەرییەکانی لە سەری ڕێکەوتوون لە جیهاندا یەک ناگرنەوە، بەمەیش ئەو دەرمانە دەبێتە دەرمانێکی ساختە و ناکارا لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان و لە هەمان کاتیشدا دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە نەخۆش.

**پۆلێنکردنی جۆرەکانی دەرمانی ساختە:**

ـ ئەو دەرمانانەی هیچ مادەیەکی کارا لە خۆ ناگرن و هیچ جۆرە چارەسەرێکیان لە ناو نییە

و نەخۆش سودیان لێ نابینێت.

- ئەو دەرمانانەی بڕێکی زۆریان لە مادەی کارا تێدایە و دەبێتە هۆی زیادەڕۆیکردن.

- ئەو دەرمانانەی مادەی کارایان تێدایە، بەڵام بۆ چارەسەر پێویست نین.

- ئەو دەرمانانەی بڕێکی تەواویان تێدایە، بەڵام لە ناو پاکەتی هەڵە دانراون.

-ئەو دەرمانانانەی بریتین لە لەبەرگیراوەیەکی لاساییکەرەوەی بنەڕەتییەکە (بەڵام بێ مۆڵەتی کۆمپانیا ڕاستەقینەکە)

- ئەو دەرمانانەی بڕێکی زۆریان لە مادەی ناپێویست تێدایە و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە جەستەی مرۆڤ.

هەر لەو پێناوەدا چەندین ڕێسای یاسایی و کۆتوبەند دانراون لەو بارەیەوە، کە جۆر و دروستکردنی دەرمانیان ڕێک خستوە.

یاسای عێراقییش لە ژێر ڕۆشنایی گرینگیی ئەو بابەتە و مامەڵەکردنێکی تەندروستانە بە دەرمان و بەکارهێنانی، هەروەها بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی تاوانی ئابووریی نیشتیمانی، چەند یاسایەکی تایبەت کردوە. جگە

لەوەیش، لە کاتی ئێستادا بوەتە بابەتێکی گرینگ بە هۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی دەرمانی ساختە و مامەڵەکردن پێیەوە بە شێوەیەکی نایاسایی و نافەرمی، دواتریش بە هۆی ئەو لێکەوتانەی لێی دەکەونەوە.

**ناساندانی غەش لە دەستەواژەی یاساییدا:**

غەشکردن واتە: پێشێلکردنی ئەرکی راستگۆیی، یان روون رەوانی کە یاسا سەپاندویەتی، یان رێککەوتن، یان سروشتی مامەڵەکردن، یان متمانەی تایبەتی.

سیستەمی بەرەنگاربوونەوەی غەشکردنی بازرگانی، بەرهەمی ساختەکار بەو شێوەیە ناساندوە: هەر بەرهەمێک گۆڕانکارییەکی تێدا کرابێت و دەستکاریی رواڵەتەکەی، کە بەهای مادی یان مەعنەوی لە دەست دەدات. چ بە مەبەستی کەموکورتی، یان دروستکردنی، یان لە خودی بەرهەمەکەی، یان سروشتەکەی، یان رەگەزەکەی، یان جۆرەکەی، یان شێوازەکەی.

**ناساندنی دەرمان لە دەستەواژەی پزیشکیدا:**

ڕێکخراوی خۆراک و دەرمانی ئەمەریکی بەو شێوەیە وەسفی دەرمان دەکات: هەر مادەیەک، یان مادەیەکی سروشتی، یان دروستکەر، ئامادەیە بۆ بەکارهێنان بە مەبەستی دەستنیشانکردن، یان وەک چارەسەرێک یان خۆپارێزی لە نەخۆشییەکانی تووشی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەبنەوە. هەروەها ئەو مادانەیش دەگرێتەوە (ناخۆراکییەکان) ئامادەکراو بۆ کاریگەربوون بە سەر پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ، یان چالاکییەکانی لە ناویدا.

ڕەنگە ئەو پێناسەیەی بۆ دەرمان هاتوە لە دادگاکانی ئەورووپاوە باشترین نموونە بن، بە هۆی ئەو بەها یاساییەی هەیەتی لە ناوەڕۆکەکەیدا، بەو پێیەی دەرمانی بە (هەر بەرهەمێک چارەسەرێک لە خۆ بگرێت یان مرۆڤ دەپارێزێت لە نەخۆشی) وەسف دەکات.

بەڵام دوا جار خاڵی سەرجەم ئەو ناساندانە دەرمانە، کە وەک فاکتەرێک بۆ چارەسەر یان دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان دادەنرێت، کە تووشی جەستەی مرۆڤ دەبێتەوە، یان لە

ئازارەكانی سوک دەكات، بەو پێیەی لە ناو پێكهاتەكانیدا ڕۆڵێكی كارای دەگێڕێت لەگەڵ تایبەتمەندییە فسیۆلۆژییەكانی بۆ جەستەی نەخۆش هەیە. دوا جاریش دەتوانین بڵێین دەرمانی ساختە: واتە ئەو دەرمانانەی لە دەرەوەی سیستەمی دروستكەری دەرمانی شەرعی یان لە ناویدا دەكرێت، بەڵام پێكهاتە و چۆنێتیی ئامادەكردنی لەگەڵ سیفەت و پێوەرەكانی لە جیهاندا لە سەری ڕێكەوتوون ناگونجێت و ناكارایە و كاریگەرییەكی ئەوتۆی نابێت بۆ چارەسەركردنی نەخۆش. هەروەها دەبێتە هۆكاری زیانگەیاندن بە نەخۆش.

**ڕواڵەتەكانی دەرمانی ساختە:**

یەكێک لە ڕوخسارەكانی دەرمانی ساختە، دروستكردنی دەرمانە لە شوێنی نایاسایی، واتە لە دەرەوەی چوارچێوەی پێگەی تایبەتكراو و تەرخانكراو بۆ دروستكردنی دەرمان.

كارگەی دەرمان: بریتییە لە دامەزراوەیەک، كە تێیدا كەرەستەی دەرمانسازی و دەرمانی تێدا دروست دەكرێت بە پێی بنەما

مومارەسەکراوەکان بۆ دروستکردنی دەرمان (GMP). یان دامەزراوەیەکی دەرمانخانەیە و تێیدا دەرمان ئامادە و دروست دەکرێت، یان دروستکردنی دەرمانی سەرەتایی لە سەر چوارچێوەی پیشەسازیی بە مەبەستی فرۆشتنی بە کۆ.

بە گوێرەی دەقەکانی یاسا بێت پێویستە چەند هەنگاوێک و ڕێکارێک هەبێت بۆ کردنەوەی کارگەی دروستکردنی دەرمان:

أ. دەستبەرکردنی مۆڵەتی پیشەسازی لە لایەنە پێوەندیدارەکان.

ب. پێویستە بەڕێوەبەری هونەری کارگەکە دەرمانساز بێت و مۆڵەتی کاری هەبێت.

ت. مەرجەکانی کارگە دروستکردن و تایبەمەندییەکانی هەبێت.

بۆیە بە پێی ئەو مەرجانەی سەرەوە، دروستکردنی دەرمان لە شوێنێکی بێ مۆڵەت بە یەکێک لە دیاردەکانی غەشی دەرمانی هەژمار دەکرێت، بە تایبەتییش گەر هات و ئەو شوێنە پێوەری داواکراوی نەبێت.

(زۆر جاریش دەرمانی ساختە لە شوێنی نایاسایی یان بێمۆڵەت دروست دەکرێن و

هیچ جۆره مەرجێک و پێوەرێکیان نییە بۆ بەرهەمهێنان، ڕووبەرەکەی تەنیا ژوورێکی ئاسایە.

زۆربەی جاریش ئەو دەرمانە ساختانە لای فرۆشیارە دەستگێڕەکان دەفرۆشرێن. ئەو دیاردەیەیش لە زۆربەی شارەکاندا بە دی دەکرێت، چونکە ئەو کەسانە کڕیاری ئەو جۆرە دەرمانانەن، کە کەمدەرامەتن و نرخی دەرمانیان پێ نییە، تەنیا دەست دەگرن بە تاکە ئومێدێک بۆ چاکبوونەوە بێ ئەوەی دڵنیا بن لە جۆرێتیی پێوەر و تایبەتمەندییە تەندروستییەکانی، کە گرەنتیی کارایی و ڕادەی پاراستنی ەەکاتەوە و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە نەخۆش لە زۆربەی حاڵەتەکاندا. زۆر جاریش ئەو جۆرە دەرمانە ساختانە لە شوێن و دامەزراوەی نەگونجاو هەڵدەگیرێن، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا کارەکە خراپتر دەکات، چونکە دەرمان بە گشتی بە تێپەڕبوونی کات ڕادەی کارایی لە دەست دەدات، بۆیە پێویستە دروستکەری دەرمانەکە هاوپێچێک لەگەڵ دەرمانەکە دابنێت و تێیدا چۆنێتیی پاراستنی و پارێزگاریلێکردنی لە تێکچوون ڕوون بکاتەوە لە کاتی هەڵگرتنی.

**- نەبوونی مادەی کارا لە ناو دەرمان**

کڕینی دەرمان بە ڕێگەی کەناڵە گونجاوەکان - وەک دەرمانخانە- دەکرێت، بەو پێیەی ئەو بەرهەمە لەگەڵ تایبەتمەندییەکان یەک دەگرێتەوە و ئەو بڕە مادەی کارایەی لە خۆ گرتوە کە پێویستە تێیدا هەبێت. واتە: دەبێت دەرمانەکە بە ڕاستی مادەی کارا لە ناویدا هەبێت و بە گوێرەی مەرجە یاساییەکان دروست کراوە و دڵنیایە هەیە لە ڕادەی کارایی بێ هیچ غەش و ساختەکارییەک، چونکە دەرمانی پزیشکی بریتییە لە مادەیەکی تاک یان پێکهاتەیی یان کۆمەڵە مادەیەکی کیمیایی. پێویستیشە ئەو مادەیە سروشتی بێت، یان دروستکراو بێت. لە هەر حاڵەتێکیش لە حاڵەتە (پتەوی، یان شلی. یان گازی) بێت، پێویستە مادەیەکی چارەسەری تێدا بێت. ئەو مەرجەیش خۆی لە بنەڕەتدا لە مادەی (1 - 5111)ی یاسای تەندروستیی گشتیی فەرەنسی بە ژمارە (303) بۆ ساڵی 2002 دانراوە. کە بە دەرمانی پزیشکی بەو شێوەیە ناساندوە: هەر مادەیەک، یان پێکهاتەیەک چەندین تایبەتمەندیی چارەسەرکردن یان خۆ پاراستن لە خۆ بگرێت.

ڕەنگە دەرمانی ساختەکار چەندین شێوە و

جۆری وەربگرێت. ئەوانیش:

1. ئەو دەرمانانەی هەمان مادە یان کەرەستەی دەرمانیی کارا لە خۆ دەگرن، کە لە دەرمانی ڕاستەقینەدا هەن، بەڵام بە بڕێکی زۆر کەم یان زۆر نزم، یان لەوانەیە ماوەی بە سەر چووبێت، بەمەیش نەخۆش هیچ سودێکی لێیەوە نابینێ لە خواردنیدا.
2. ئەو دەرمانانەی مادەیەکی تریان تێدایە. وەک گیراوەی ئەلەمنیۆم وەک مادەیەکی (حشوە) بۆ پڕکردنەوەی.
3. ئەو دەرمانانەی هیچ مادەیەکی کارا لە خۆ ناگرێت. ئەم جۆرە دەرمانەیش نەک هەر نەخۆش لە ڕووی مادییەوە زیانی پێ دەگەیەنێت، بەڵکوو دەیکاتە نێچیری وەهم و هەمیشە بەردەوام دەبێت لە خواردنی.
4. ئەو دەرمانانەی لە لایەن وڵاتانەوە مۆڵەتیان پێ دەدرێت و هیچ هەیئەتێکی پیشکەوتوویان نییە و ناکەونە بەر زومی چاودێریکردنەوە، تەنیا بەو شێوەیە مۆڵەتیان پێ دەدرێت گوایە گژوگیای سروشتین، کەچی جگە لەوەی بە مادەیەکی کیمیایی ساختە کراوە، دەرمانێکی کارایش نییە.

- ساختەکردنی ناوی بازرگانی یان هێمای بازرگانی یان وڵاتی دروستکەر

ساختەکردن لە دەستەواژەی شەرعیدا بە: (ئەنجامدانی کارێک کە خودایش حەرامی کردوە بە ڕێگەیەک کە خەڵکیش درکی پێ ناکات و سەرەتا وەک کارێکی ڕاستەقینە دەردەکەوێت.

ساختەکردنی هێمایەکی بازرگانییش لەو ڕووەوە دەردەکەویت، کاتێک لە لایەن کەسێک، یان کۆمپانیایەک بە بێ مۆڵەتی خاوەنە ڕاستەقینەکەی هێماکە بە کار دەهێنرێت. تاوانی دزینی هێمای بازرگانییش دەچێتە نێوان تاوانی ساختەکردن یان لاساییکردنەوە. کە وەبەرهێنەران تووشی زیانی زۆر دەکاتەوە لە ئەنجامی بردنی هێما بازرگانییەکە. مەبەستیش لە بردنی هێمایەکی بازرگانی واتە: (کاڵاکە یان پاکەتەکە هەمان هێمای لە سەر بێت) یان بە ئاسانی جیا نەکرێتەوە لەگەڵ هێما ڕاستەقینەکە. زۆربەی جار ساختەکاران و بازرگانانی دەرمان بە شێوەیەک لاسایی دەکەنەوە، کە زۆر ئەستەمە بزانرێت.

(بە پێی مادەی چلوسێ لە سیستەمی هێما بازرگانییەگانیشدا هاتوە کە هەر کەسێک تاوانێکی لەو جۆرە بکات، بۆ ماوەی ساڵێک زیندانی دەکرێت، لەگەڵ غەرامەی پەنجاهەزار ڕیاڵی سعوودی).

**تاوانی فرۆشتنی دەرمانی سەرچاوە ناڕوون چییە:**

بازرگانیکردن بە دەرمان دەچێتە خانەی تاوانەکان، چونکە کاریگەریی سەلبی لە سەر ژیانی تاک و کۆمەڵگەکان دروست دەکات. هەر تاوانێکیش سزای خۆی هەیە. یاسای سزاکانیش بە کۆمەڵە ڕێسایەکی یاسایی ناسراوە، کە هەر وڵاتێک بە پێی یاساکانی خۆی سزا بۆ تاوان و کردەوەکان دادەنێت.

یاسایش بە شێوەیەکی گشتی و دادوەریش بە تایبەتی بریتییە لە یەکێک لە فاکتەرەکانی پاراستنی کۆمەڵگە. جگە لەوەی کە ڕەنگدانەوەی واقیعی ئەو کۆمەڵگەیە و کاریگەریشە پێیەوە هیچی تر نییە، بۆیە ئامانج لێی پاراستنی بەها سەرەکییەکان و دۆزینەوەی چارەسەرە بۆ هەموو ئەو کێشانەی کە دەبنە مایەی دروستبوونی

پشێوی و مەترسییەکانی ڕووبەڕووی سیستەم و بەرژەوەندییەکانی دەبنەوە.

هەر لە سەر ئەو بنەمایەدا زۆر جار دەبینین چەندین پایە و بنەمای سەرەکی هەن، کە سیاسەتی تاوانکاری لە سەریان بونیاد نراوە لە هەر وڵاتێکدا. بەو پێیەی ڕۆڵی یاسا زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت لە مانەوەی کۆمەڵگە و کارکردن بۆ بەرەوپێشەوەچوونی و بەدیهێنانی ئامانجەکانی. ئەو ڕۆڵەیش لە کاتی ئێستادا بە وەزیفەیەکی نوێتر بۆ یاسا بە دیار کەوتوە سەبارەت بە کارکردن بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە و پاراستنی کیان و گرەنتی مانەوەی بێ مەترسی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕۆڵە گرینگەی دەرمان دەیگێڕێت لە پاراستنی هەر تاکێک و کۆمەڵگەیەک و پارێزگاریکردن لە تەندروستی بە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، یان کەمکردنەوەی ئێش و ئازارەکان، یان خۆپاراستن لێی، بۆیە پرسی دەرمان گرینگییەکی زۆری پێ دراوە لە ڕووی یاساییەوە، ئەویش بە تاوانباردانانی هەر پێشلێکارییەک، کە بریتی بێت لە دەستدرێژی یان لادان لە یاسا دەگرێتەوە.

**سروشتی یاسایی لە سەر**

**تاوانی دەرمانی سەرچاوە نادیار**

بێگومان هەر تاوانێکی یاسایی، بە جیاوازیی باروودۆخ و فاکتەرەکانیانەوە، سروشتی تاوانەکە لە سەر بنەمای ڕادەی تاوانەکە دیاری دەکرێت، بەو پێیەی یان گوناهێکە کراوە یان سەرپێچییەکە، ڕەنگە لە سەر بنەمای جۆری ڕەفتاری تاوانکارییەکە دیاری بکرێت بە سەیرکردنی دەقی تاوانەکە، یان ڕادەی کاریگەربوونی لە سەر ئابڕووی نیشتیمانی و چەند پێوەرێکی تریش. سەبارەت بە سروشتی یاسایی تاوانی هەڵگرتنی دەرمانی سەرچاوە نادیاریش، ئەوە بە تاوانی ئابووری هەژمار دەکرێت، چونکە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە سیستەمی کۆمەڵگە و تەندروستیی گشتی.

## ڕوکنەکانی تاوانی دروستکردنی دەرمانی ساختەکار

وەک هەر تاوانێکی تر، تاوانی دەرمانی ساختەیش ڕوکنی خۆی هەیە:

ڕوکنی شەرعی

ڕوکنی مادی

ڕوکنی مەعنەوی

1. **ڕوکنی شەرعی:**

ناساندنی ڕوکنی شەرعی: (واتە دەقی پێویست بۆ بە تاوانکردنی کردەوەیەکی پێچەوانە بە پێی ڕێساکان لە فقهی ئیسلامیدا)

هەندێک کەس پێی وایە (دەقی ئەمر و نەهی) واتە ڕوکنی شەرعی، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە دەقەکە سەرچاوەی ڕوکنی شەرعییە، بەو پێیەی سەرچاوەی سیفەتێکی نامەشروعی کردەوەیە. جگە لەوەیش سیفەتی ناشەرعی بۆ کردەوە تەنیا پشت بە ملکەچکبوونی بۆ دەقی ئەمر و نەهی نییە، بەڵکوو دەبێت ملکەچیی ڕێسای دەرخستن بێت، چونکە ملکەچبوونی بۆ ئەو ڕێسایە واتە نەهێشتنی سیفەتی نامەشروع، هەر چەندە پێشتر ملکەچیی دەقی ئامر و نەهی بوە.

بەمەیش بۆمان دەردەکەوێت کە ناساندنی ڕوکنی شەرعی واتە: دەقە شەرعی و نیزامی و یاساییەکانی، بە شێوەیەکی ڕاستەقینە سزای بە سەر کردەوەیەکی دیاریکراودا داوە.

بەتاوانکردنی ساختەکاریی دەرمان لە شەرعیەتی ئیسلامیدا:

شەریعەتی ئیسلامیش دەرمانی ساختە بە فاکتەرێک بۆ زیانگەیاندن بە خەڵک و دادۆشینی پارە لێیانەوە وەسف دەکات. چونکە ڕاستی و دروستی ساختەکردن واتە شاردنەوەی و بێ دەنگ بوونە لە کاڵایەک، کە پڕ لە کەموکوڕی و ساختەکاری.

2. **ڕوکنی مادی:**

ڕوکنی مادی لە تاواندا بە: (کردەویەک کە لە تاوانبارێکەوە ئەنجام دەدرێت، کە ڕوخسارێکی دەرەکـی هەستیار و بـەرجـەستـەی هـەیـە و کاریگەرییەکی زیانبەخش دروست دەکات بۆ کۆمەڵگە.)

ڕوکنی مادییش سێ ڕەگەز لە خۆ دەگرێت (ڕەفتاری تاوانکاری ـدەرئەنجامی تاوانکاریـ هۆکاری پەیوەستبوون) ئەوانیش بریتین لە:

**- ڕەفتاری تاوانکاری (کردەوەی تاوانکاری)**

ڕەفتاری تاوانکاری: کە جەوهەری ڕوکنی مادی تاوانە و یەکێکە لە سێ ڕەگەزەکانی. لە لایەن فوقهەکانی یاسایی بە (هەر کارێک، یان کردەوەیەک یاسا سزای بۆ دانابێت بە سزای جەزائی.

**- دەرئەنجامی تاوانکاری**

دەرئەنجامی تاوانکاریی ڕەگـەزی دوەمـی ڕوکنی مادی تاوانە. لە ڕەفتاری تاوانکاری جیایە، بەو پێیەی ئەو کارەیە کە یاسای تاوانکاری لە سەر سەپاندنی سزا کاری پێ دەکات. یاسای تاوانکارییش کاتێک بە سزا دەست پێ دەکات لە سەر دەرئەناجمی تاوانکاری، تەنیا لە سەر

چەند حاڵەتێک کورت، کە تێیدا زیانێکی کردەیی وەک کاریگەرییەک بۆ ڕەفتاری تاوانکاری ڕوو دەدات کورت نابێتەوە، بەڵکوو ڕەنگە پێی وابێت بەرژەوەندیی گشتی وا دەخوازێت بە سزایەک دەستووەردان بکات. ئەو دەرئەنجامەیش کاریگەریی مادی هەیە و لە تاوانی دەرمانی ساختە خۆی دەبینێتەوە بە ئەنجامدانی غەشکردن لە دەرمان و بازرگانیکردن پێوەی لە سەر ئەستۆی مرۆڤەکان و گیان و جەستەیان.

دەرئەنجامی تاوانکاریش لە لایەنی نیزامییەوە بە ڕەفتاری تاوانکاری وەسف دەکرێت، کە دەبێتە هۆی ڕوودانی دەرئەنجام یە تاوانکاری، یان ئەوەی ئەو دەرئەنجامە دەخولقێنێ.

بەمەیش بۆمان دەردەکەێت دەرئەنجامی تاوانکاریی لە تاوانی دروستکردنی دەرمانی ساختە بریتییە لە دەستدرێژیکردنە سەر مافی تاک لە پاراستنی جەستە و پارەکەی لە دەرمانی ساختەدا. هەروەها دەکرێت دەرئەنجامی تاوانکاری لەو تاوانەدا بریتی بێت لە زیانگەیاندن بە جەستە، یان هۆکاری ئیفلیجبوون، یان تەنانەت مردنیش بە هۆی دەرمانی ساختەوە.

**هۆكاره پێوەندیدارەكان**

هۆكاره پێوەندیدارەكان: واتە ئەو پێوەندییە كردەوە بە دەرئەنجامەكەی دەبەستێتەوە، بە شێوەیەک بیسەلمێنێت كە ڕوودانی ئەنجام دەگەڕێتەوە بۆ ڕوودانی كردەوە، واتە گەر تاوانبار ئەو كردەوەیە نەكات ئەو دەرەئەنجامە دروست نابێت.

هۆكاره پێوەندیدارەكان مەرج و ڕەگەزێكی پێویستیشە بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی، چونكە گەر توانیمان كردەوەی تاوانكاری بە زیان ببەستینەوە، ئەوە دەتوانین هۆكاری نێوانیان دیاری بكەین.

3. **ڕوكنی مەعنەوی**

ڕوكنی مەعنەوی بۆ تاوان بەوە دەناسرێت كە: ئەو ئیردایەی كەسی تاوانباری جووڵاندوە بۆ ئەوەی كردەوەی تاوانكاری لێیەوە دەربچێت. مەبەستیش لەو كەسەیەكە كە ئەو كردەوەیەی ئەنجام داوە و شێوازی پێویستیشی بە كار هێناوە بۆ جێبەجێكردنی كە بە مەبەستی تاوانكاری یان سەرپێچی ناو دەبرێت.

ڕوكنی مادییش زۆربەی جار دوو وێنە لە خۆ دەگرێت. مەبەستی تاوانكاری یان هەڵەی بێ مەبەست. گەر هات و بە مەبەستی تاوانكاری

بوو، ئەوە پێویستە ڕەگەزی زانستی و ئیرادە و ڕووتێکردنیان بۆ سەرجەم ڕەگەزەکانی تاوان. گەر هات و باسەکەیشمان لە سەر بێ مەبەست بێت، ئەوە دەبێت زانست و ئیرادەی بەردەست بن، بەڵام لەگەڵ جیاوازیی چوارچێوەی ئاڕاستەی ئیرادە لە هەڵەی بێ مەبەست لە بە مەبەستدا.

**سزاکانی لە سەر دروستکردنی دەرمانە ساختە دەسە پێنرێن:**

سزاکانی بە سەر تاوانی دروستکردنی دەرمانی ساختە جێبەجێ دەبن بە سەر سێ جۆر دابەش دەبن:

1. سزای بنەڕەتی
2. سزای بە دوای یەکداهاتن
3. سزای تەواوکەر

سزای بنەڕەتی: واتە ئەو سزایەی سیستەم بە بەشێکی سەرەکی بۆ تاوان سەیر دەکرێت و بە سەر ئەو کەسانەدا جێبەجێ دەبێت کە تاوانەکەی بە سەردا ساغ دەبێتەوە. ئەو سزایەیش تەنیا لە لای دادوەرەوە دەسەپێنرێن.

تاوانی دروستکردنی دەرمانی ساختەیش دەچێتە خانەی بەهێزکردن: واتە ئەو سزایانەی کە لە لایەن بەخێوەکەر، یان دادوەرە دادەنرێت.

## سەرچاوەکان:

1. ال ئیبراهیم: هدی خالد. (2016) بەرپرسیاریتیی تاوانکاری لە سەر بازرگانیکردنی نایاسایی بە دەرمان لە سیستەمی سعوودیەدا. زانکۆی نایفی عەرەبی بۆ زانستە ئەمینەکان. ڕیاز

2. ئەمین" بوخاری مستەفا. (2015)، بەرپرسیاریتیی دەرمانساز لە سەر پیدانی دەرمان، نامەی ماستەر، زانکۆی ئەبی بەکر بلقاید، تیزێکی دکتۆرایە و پیشکەشی کۆلیژی یاسا، زانکۆی مەنسورە.

3. البوابة الكترونيه للهيئة العامة للغذاء والدواء. www. sehatok. /com

4. /https://ahlmasrnews. com/news/article/555125 جمارك-السلوم-تحبط-محاوله-تهريب-كميه-من-الردويه-والهواتف-المحموله

5. /9/9/https://www.alaraby.co.uk/investigations/2014 الدواء-في-زمن-الحرب-التهريب-شرقا-وغربا-إلى-ليبيا

6. https://unsmil. unmissions. org/sites/default/files/ n1803950_0. pdf

Please note that this report contains information collected from 2008 until September 2013.

84 questionnaire responses were received from police (via INTERPOL NCBs), customs (via the World Customs

Organization (WCO)), and drug regulatory authorities (via the Working Group of Enforcement Officers (WGEO) and the Permanent Forum on International Pharmaceutical Crime (PFIPC)).

Open-source monitoring was carried out through specific searches using Factiva, an online database providing

access to articles produced by over 28,000 media sources. Further searches were carried out via search engines

and on websites specialized in pharmaceutical crime and other medical issues.

PFIPC is an international enforcement forum aimed at protecting public health and safety through the exchange of information and ideas to foster mutual cooperation. The members of PFIPC are dedicated professionals from 15 countries worldwide whose goal is to enhance the protection of public health by combating pharmaceutical crime.

HMA WGEO was established to contribute to the protection of public health and animal health and welfare

through ensuring adherence to the regulations of the manufacturing and distribution chains of medicinal products, the disruption of illegal activities and the sharing of information

In 2002, the Security Directors from 14 major pharmaceutical companies established the Pharmaceutical

Security Institute as a non-profit corporation based in the US. In total, eight pharmaceutical companies responded to the INTERPOL questionnaire. Out of the eight, three companies answered that they had observed

an involvement of OCGs in pharmaceutical crime since 2008.

7 12 of the 84 replies to the questionnaires.
8 "Desarticulan en Guatemala banda que falsificada medicamentos", Agence France Presse, 8 June 2013.
9 84 questionnaire responses received from police (41), customs (34) and DRAs (9). It should be noted that
questionnaire replies from police and customs in two countries were identical, and thus results from these questionnaires have only been counted once
10 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.
11 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.
12 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.
13 CTK Daily News, 26 July 2011, Czech police break up gang of fake anabolic producers; The Daily Telegraph, 18
May 2011, Britons arrested in Spanish drugs raid - Seven from UK among 26 held on dope charges Distribution
ring linked to Glasgow and Manchester.
14 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.
15 http://www. asiantribune. com/news/200328/01//

govt-act-public-consumes-5m-slimming-tablets-year

16 http://www. whpa. org/background_document_counterfeit_medicines_in_asia. pdf

17 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.

18 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.

19 Response from PSI members regarding INTERPOL Questionnaire on Pharmaceutical Crime and OCGs.

20 This finding is based on questionnaire replies and results from Operation Pangea. Operation Pangea is a

yearly global operation, coordinated by INTERPOL, which brings together law enforcement, customs, drug

regulatory authorities and the private sector to target the illegal online supply of medicines to the public.

21 For example, dietary supplements and hair-loss products.

22 The questionnaire reply also indicates that the groups travel to an Asian country to import finished medicines. However, the majority of their dealings in Asia concern the purchase of raw ingredients, as mentioned above.

23 US Department of Justice, 17 February 2012,

Two New York men charged with selling fraudulent oxycodone
prescriptions,http://www. justice. gov/usao/nj/Press/files/Polo,%20Jack%20et%20al%20Arrests%20News%20Re
lease. html and David Giambusso, 31 August 2011, Twin sisters are charged with operating N. J. oxycodone
distribution network, http://www. nj. com/news/index. ssf/201108//twins_sisters_are_charged_with. html

24 Targeted News Service, 18 August 2011, 'DEA San Diego/El Cajon PD Arrest 60 in Nine Month Operation'

25 Seattle Time, 18 August 2012, Seattle-Area Raids Target Oxycodone Ring,
http://blogs. seattletimes. com/today/201208//federal-agents-searching-multiple-seattle-locations

26 United Nations, Report of the Monitoring Group on Somalia and Eritrea, UN Doc. S/2011433/, New York, 18
July 2011, para 76, p. 31.

27 Various seizure reports received via the United Nations Office on Drugs and Crime (UNODC) Regional Office
for West and Central Africa.

28 Dubai foils Dhs1b drug smuggling bid, Gulf Today, 2 May 2012, http://gulftoday. ae/portal/13d162bd-bad7-
461b-82d796-c2e1fb058e. aspx; Seven suspected

drug dealers arrested, Gulf News, 22 May 2012,
http://gulfnews. com/news/gulf/uae/crime/seven-suspected-drug-dealers-arrested-1. 1026066; Trio tries to sell
tramadol pills to undercover police officer, 3 May 2012, Khaleej Times,
http://www. khaleejtimes. com/nation/inside. asp?xfile=/data/courtroundup/2012/May/courtroundup_May4. x
ml&section=courtroundup

29 The Moscow Times, 10 February 2012, 'Ex-Cop Runs Bogus Drug Plant at Home,'
http://www. themoscowtimes. com/business/article/ex-cop-runs-bogus-drug-plant-at-home/452818. html

30 Europol, 2013. Threat Assessment 2013 – Counterfeit goods violating health, safety and food regulations and
sub-standard goods; p. 9.

31 Europol, 2013. Threat Assessment 2013 – Counterfeit goods violating health, safety and food regulations and
sub-standard goods; p. 13.

32 UNODC, 2013. "Fraudulent essential medicines from East Asia to Southeast Asia and Africa" in Transnational
Organized Crime Threat Assessment – East Asia and the Pacific; p. 136.

33 Europol, 2013. Threat Assessment 2013 –

